حکومەتی هەرێمی کوردستان – عیراق

وەزارەتی پەروەردە

بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# پـــەروەردەی ئیســــلامی

## پۆلی دەیەمی ئامادەیی

## وقۆناغی یەکەمی خوێندنی پیشەیی و پەیمانگەکان

**ئامادەکردن و پێداچوونەوەی زانستی**

**لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە**


چاپی یەکەم    ١٤٣٦ کۆچی    ٢٧١٥ کوردی    ٢٠١٥ زایینی

﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾

( طه ١١٤ )

**سەرپەرشتی زانستی:** فاروق محمد علی عباس

**سەرپەرشتی هونەری چاپ:** عوسمان پیرداود كواز

ئاری محسن احمد

**بەرگ:** عادل زرار ئەمین

**تایپكردن و جێبەجێكردنی بژاری هونەری:** ئاری محسن احمد

**دیزایین:** سابات صدقی اسماعیل

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

مامۆستایانو قوتابیانی خۆشەویست، ئەمەی لەبەر دەستاندایە پرۆگرامی بڕیار لەسەر دراوی بابەتی (پەروەدەی ئیسلامی) یە بۆ پۆلی دەیەمی ئامادەییو قۆناغی یەکەمی خوێندنی پیشەییو پەیمانگەکان، لە لایەن وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، ئەم پرۆگرامە بە هەنگاوێکی گەورە لە بواری وتنەوەی ئەم بابەتە دەژمێردرێت، چونکە چەندەها ساڵە ئەم بابەتە لە ژێر باری پرۆگرامێکی کلاسیکی کۆنەوە دەناڵێنێت، کە نەیتوانی ئامانجی وتنەوەی ئەم بابەتە بپێکێت، بۆیە لە پاش ئەنجامدانی چەندەها لێکۆڵینەوەی مەیدانی لە لایەن پسپۆڕانی ئەم بوارەوە، وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە پێویستی زانی پرۆگرامێکی نوێ بۆ ئەم بابەتە دابڕێژرێت، کە بگونجێت لەگەڵ پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەکان،و رێنیشاندەربێت بۆ قوتابییە خۆشەویستەکانمان لە ناسینەوەی راستی ئاینە پیرۆزەکەیان،و هەروەها زانیاریان لە سەر ئاینەکانی دیکەش هەبێت، بۆ دەوڵەمەند کردنی باری مەعریفیان، چونکە زۆربەی ئەم ئاینانە لە کوردستانو عیراق شوێنکەوتویان هەیە.

به خوێندنو خوێندنەوەی بابەتەکان ئەوەتان بۆ روونده‌بێتەوە کە بابەتەکان بەشێوازێکی هاوچەرخانە ئامادەکراونو دەخوازن دیدێکی کراوەو رۆشنو بێ گرێو گۆڵ بۆ قوتابیان دروست بکاتو بیانپارێزێت لە تێگەیشتنی ناڕاستو کەموکورت دەربارەی ئیسلام وەك ئاینی زۆرینەی هەرە زۆری کۆمەڵگەکەمان.

هەروەها تازەگەری لە چۆنیەتی خستنەڕووی بابەتەکانیش کراوە، لە کۆتایی بابەتەکاندا کۆمەڵێك پێشنیارو گفتوگۆو پرسیار وروژێنراوە بۆ ئەوەی قوتابیانیش بەشداری لە دەوڵەمەند کردنی وانەکەدا بکەنو تەنها وەك ئەرکێکی قوتابخانەی خۆیان نەچنە پۆلەکانەوە بەڵکو مەبەستیان سود وەرگرتنو پەروەردەبوونو بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری خۆیان بێت، ئێمە دڵنیاین ئەم پرۆگرامە دەبێت بە یەکێك لە پرۆگرامە پێشکەوتووەکانی، نەك تەنها لە عیراق بەڵکو لە خۆر هەڵاتی ناوەڕاستیشو رۆڵی زۆر دەبێت لە بەرزکردنەوەی ناو و ناوبانگی هەرێمو بەرەو پێشبردنی رەوتی بیری چاکسازیی لە بواری فیکری ئیسلامیو پرۆگرامی ئاین لە ناوەندەکانی خوێندندا، هیواداریین مامۆستایانیش وا سەیری ئەم بابەتە بکەن کە رۆڵێکی گەورە دەگێڕێت لە پەروەردەکردنو پاراستنی شوناسی نەوەی نوێو کردنەوەی ئاسۆی نوێ بەڕوویدا هەر لەو سۆنگەشەوە بە بایەخەوە بابەتەکانی بە قوتابیان

بلێنەوەو ئەرکی سەرشانیان لەم رووەوە جێبەجێ بکەن. وئەم چەند خاڵەش وەك رێنوێنیو ئاسانکاری دەخەینە بەر دیدی مامۆستایانی بەڕێز:

١ - دابەشکردنی بابەتەکان بۆ چەند وانەیەك، تەنها بۆ کار ئاسانی مامۆستایانە، ئەگەر وتنەوەو تەواکردنی بابەتکە بخوازێت ئەم دابەشکردنە تێپەڕێنێت ئاساییە.

٢ - مامۆستایان بۆ هەر وانەیەکی نویێ پێشتر داوا لە قوتابیان بکەن وەك ئەرك خۆیانی بۆ ئامادە بکەنو سەرەتا لە پۆلدا لە رێی هەندێك پرسیارەوە بەشداری وتنەوەی وانەکە بکەنو دواتر مامۆستا وانەکە شی بکاتەوە.

٣ - مەبەست لە نەهێشتنی لەبەرکردن دورخستنەوەی قوتابییە لە (تەلقین)و بێزاری، بۆیە نابێت لە تاقیکردنەوەکانیش پرسیاری قورس بهێنرێتەوە قوتابی پێ بترسێنرێت، چونکە مەبەست لەم وانەیە پەروەردەکردنی قوتابییە نەك ترساندنی.

٤ - سروشتی بابەتەکان وا دەخوازن مامۆستایانی بابەت بە باشی خۆیان ئامادە بکەن، کە گومانمان لە وەدا نیە کە ئەوانیش دەرك بەم مەسەلەیە دەکەن.

٥ - داواکارین لە بەڕێوەبەرانی قوتابخانەکان بایەخ بەم بابەتە بدەن بە دەستنیشان کردنی مامۆستای پسپۆڕو لێهاتوو بۆ وتنەوەی بابەتەکە، چونکە سیاسەتی نوێی پەروەردەیی حکومەتی هەرێم بایەخدانە بە پەروەردە کردنی نەوەکانی ئەم هەریمە.

٦ - پێویستە مامۆستایان بایەخ بدەن بەو پرسیارو گفتوگۆیانەی لە کۆتایی هەر وانەیەك دانراون لە کتێبەکە، بە مەبەستی جولاندنەوەی مێشکی قوتابیانو راهێنانیان لە سەر بیرکردنەوەو گفتووگۆو شیکردنەوە، کە بێگومان لەم کارە لە بابەتەکانی دیکەی خوێندنیش سوود مەند دەبن.

**خودای گەورە پشتو پەنای هەمووان بێت.**

**لێژنەی ئامادەکار**

## وانەی یەکەم:

# یەکتاپەرستی

باوەڕبوون بە خودا مانای ئەوەیە کە بڕوات هەبێت کە (الله) خودای هەموو شتێکە، ئەو خاوەن و دروستکەری هەموو شتێکە لەم بونەوەرەدا، هەرئەوە بەتەنها شایەنی پەرستنە لەڕێگەی:نوێژو ڕۆژو و نزاو ترس و هیواو ملکەچی و کرنۆش بۆ بردنی، هەر ئەوە خاوەنی تەواوی سیفەتەکانە، بەدورە لەهەموو کەم و کورتی و ناتەواوییەك.

**پێناسەی یەکتاپەرستی:** یەکتاپەرستی واتە باوەڕت هەبێت کە جگە لە خودا هیچ خودایەکی دیکە نیەو هیچ هاوەڵ و هاوشێوەو هاوبەشێکی لە ئاسمان و زەویدا نیە بۆیە دەبێت تەنها ئەو بپەرستین و بەخودای خۆمانی بزانین.

## گرنگی یەکتا پەرستی:

١-خودای گەورە ئینسان و جنۆکەی بۆ ئەوە دروستکردوە کە بیپەرستن خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾)) الذاريات (٥٦).

بەدرێژایی مێژوو پێغەمبەرانی ناردوە بۆ مرۆڤ ، هەتا بە یەکتایی عیبادەتی بۆ بکەن، ئەگەر سەیری قورئانیش بکەین لە زۆربەی سورەتەکانیدا باسی یەکتاپەرستی دەکات و لەبەرامبەریشدا باسی زیانی هاوەڵ پەیداکردن بۆ خودا دەکات لەسەر ژیانی تاك و کۆمەڵ کە دەبێتە مایەی تیاچونیان لەدونیا و دواڕۆژدا.

٢-هەموو پێغەمبەرێك کە خودا ناردویەتی سەرەتای بانگەوازەکەی بەبانگکردن بۆ یەکتاپەرستی خودا دەستی پێکردوە.**هەر وەك خودای گەورە دەفەرموێت**: (( وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ)) (الانبياء٢٥).

پێغەمبەرمان محمد (د.خ) بۆ ماوەی(١٣) ساڵ لە مەککەدا، داوای لە هۆزەکەی دەکرد کە خودای گەورە بەیەکتایی بپەرستن و تەنها داوای نزا لەو بکەن و بێجگە لە ئەو کرنووش بۆ کەسی دیکە نەبەن، بە گشتی پێغەمبەری خودا (د.خ) بە درێژایی بانگەوازەکەی شوێنکەوتوانی بانگ کردوە بۆ یەکتاپەرستی و وازهێنان لە بت پەرستی، **هەر لەم ڕووەوە پێغەمبەر (د.خ) ئامۆژگاری عەبدوللاَ ی کوڕی عەباس دەکات و دەفەرمووێت:**

(ئەگەر داوای شتێکت کرد تەنها لە خودای داوابکە،وەئەگەر پشتت بەیەکێك بەست تەنهاپشت بەخودا ببەستە).

٣- یەکتا پەرستی دەبێتە مایەی خۆشبەختی و لێخۆشبونی تاوانەکان.

هەریەکەمان بەهۆی مرۆڤ بوونمان توشی تاوان‌و هەندێ لادان دەبین‌و دەکەوینە ناو داوی سەرپێچی خودای گەورەوە، بەڵام ئەگەر لە ئەهلی یەکتا پەرستن بین‌و هاوەڵ بۆ خودا بڕیار نەدەین، ئەوە ئەمە دەبێتە گەورەترین هۆکار بۆ خۆشبەختی‌و لێخۆشبون لە لای خودای گەورەو سڕینەوەی تاوانەکانمان پاش پەشیمان بوونەوە.

خودای گەورە لەفەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: ((**یا ابن آدم لو اتیتني بقراب الأرض خطایا- واتیتني ولم تشرك بي - لجئتك بملئها مغفرة**))، واتە:(ئەی نەوەی ئادەم گەربێت‌و بەقەد هەموو زەوی تاوانت هەبێت، ئەوکاتەی کە پێم دەگەیتەوە، هاوەڵت بۆ من بڕیار نەدابێت، منیش بەو پێوانەیە لێخۆشبونم هەیە بۆت).

## سودەکانی یەکتا پەرستی:

خودای گەورە هەموو ئاینێکی لەپێناو ناسینی خۆی‌و خۆشکردنی ژیانی مرۆڤی لەم دونیاو لەو دونیا ناردوە، هەر وەها بۆ ئەوەی لەڕووی دەرونیەوە کەشێکی ئارامی بۆ دروست بکات، لە رووەکانی دیکەی ژیانیشیەوە پەیوەندیەکی برایانەو مرۆڤانە لە نێوان تاکەکاندا بنیات بنێت‌و بەخۆشی بە یەکەوە بژین.

**یەکتا پەرستیش کەکرۆکی هەموو ئاینێکی ئاسمانی بووە، چەندین سودی مەزنی هەیە، لەوانەش:**

### ١ - رزگارکردنی مرۆڤ لە هەستی کۆیلایەتی:

مرۆڤی باوەڕدار و یەکتاپەرست نابێت کڕنووش بۆ غەیری خودا ببات، چونکە هەموو شتەکانی دیکە دروست کراون‌و دروستکەر نین . توانایان نییە سودو زیان بۆ خۆیان دابین بکەن. توانایان نییە ژیان‌و مردنی خۆیان دەست نیشان بکەن، یەکتاپەرستی رزگار کردنی مرۆڤە لەکۆیلایەتی‌و هەست بە کەمی کردن‌و ملکەچ نەکردنە بۆ هیچ مرۆڤێکی دیکە یا خود دیاردەیەکی سروشتی، مێشکی مرۆڤ رزگار دەکات لە ئەفسانەو خەیاڵات. ویژدانی مرۆڤێکی ئازاد دروست دەکات کە ملکەچی هیچ ستەمکارو زۆردارێك نەبێت، هەر لەبەر ئەوەشە مرۆڤی موسوڵمان دەبێت

مرۆڤێكی ئازای ئازادی بە ئیرادە بێت و خەبات بكات بۆ چەسپاندنی دادپەروەری و ئازادی و بەرز راگرتنی كەرامەتی مرۆڤ، هەروەها بڕوای وابێت كە هەموو مرۆڤەكان لە بەرامبەر خودادا یەكسانن و كەس هیچ رێزێكی بەسەر ئەوی دیكەوە نیە تەنها بە خودا پەرستی و چاكەخوازی نەبێت.

## ٢ - دروستكردنی كەسایەتیەكی هاوسەنگ:

مرۆڤی باوەڕداری یەكتا پەرست، كەسایەتیەكی هاوسەنگی بۆ دروست دەبێت و توشی ڕاڕایی و دوو دڵی نابێت ، چونكە تەنها روو لەخودا دەكات و ئەو دەپەرستێت و پشت بەو دەبەستێت و ژیانیشی لەم دونیا بەهۆكارێك دەزانێت بۆ دەستكەوتنی دواڕۆژو سەربەرزبونی لە رۆژی دوایدا.

## ٣ - یەكتا پەرستی دەبێتە مایەی ئارامی دەرون:

دەرونی مرۆڤی موسڵمان بە پەرستنی خودای گەورە پڕدەبێت لە هیوا و ئارامی و خۆشەویستی بۆ ژیان، هەست دەكات لەژێر فەرمانی خودایەكی لێبوردەو بەخشندەو پاك و بێگەردو مرۆڤ دۆستدایە، ترسی نیە لە خەڵك و جنۆكەو دێوو شتە وەهمیەكانی دیكە، بڕوای بەقەدەری خودا هەیە، لە ژیان و مردن و رزق و رۆزی و كارەساتەكاندا، دڵنیایە كەخودا مرۆڤی باوەڕداری خۆش دەوێت و رێنمایی دەكات بۆ چاكەو ستەمی لێ ناكات، بەمەش دەرونێكی ئاسودەی بۆ دروست دەبێت و هەست بە خۆشیەكانی ژیان دەكات.

## ٤ - یەكتاپەرستی ئیرادەیەكی بەهێز بۆ مرۆڤ دروست دەكات:

مرۆڤی باوەڕ دار هەست بە بەهێزێكی دەرونی گەورە دەكات لە كاتێكدا كە خودا لەسەرو خۆیەوە دەبینێت وهەست دەكات گەورەترین هێزی بونەوەر لە پشتیەوەیەتی، لەبەر ئەوە متمانەی تەواوی پێی هەیەو پشتی پێ دەبەستێت و بڕوای بە قەدەری ئەو هەیەو ئارام دەگرێت لەسەر لێقەومان و ناڕەحەتیەكان، هەرلەبەر ئەم مەبەستە خودای گەورە دەفەرموێت:((وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدُيرٌ))(الانعام١٧).

**واتە:** ئەگەر خودای گەورە زیانێکت پێ بگەیێنێت کەس نیە بتوانێت لە سەرت لای ببات، وە ئەگەر ویستی چاکەیەکت لە گەڵدا بکات ئەوە بزانە کە دەسەڵاتی بە سەر هەموو شتێکدا دەشکێت.

## ٥ - یەکتاپەرستی بنەمای چەسپاندنی مافەکانی هاولاتییە:

لەژێر سایەی یەکتا پەرستیدا، لەم جیهانەدا کەس لە کەس گەورەتر نیەو هەمومان مرۆڤین، وەك پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: (**الناس سواسية كأسنان المِشط**). واتە: خەڵك هەمویان وەك ددانی شانە وان، کەسیان لە کەسیان زیاتر نیە، نابێت کەس بەندایەتی بۆ کەس بکات، نابێت کەس لە کەسێکی دیکە بەرێزتر سەیر بکرێت، نابێت کەس کەس بچەوسێنێتەوە، چونکە گەورەیی تەنها شایەنی خودای گەورەیەو مرۆڤیش هەموو دروستکراوی خودان بۆ ئەوەی بە ئارامیو ئاسایشەوە بەیەکەوە بژینو هەموویان خودای گەورە بپەرستن.

## پرسیار:

١- یەکتاپەرستی چۆن دەبێتە سەرچاوەی هەست کردن بەهێزو گەورەیی بۆ مرۆڤی باوەڕدار؟

٢- بۆچی یەکتاپەرستی بۆ هەندێ کەس کە باوەڕیشیان هەیە بەگوێرەی پێویست لەسەر ژیانیان کاریگەر نیە؟ چی بکەین بۆ ئەوەی زۆرترین سوود لە یەکتاپەرستی وەربگرین؟

## وانەی دووەم:

# محمد (د.خ) کۆتا پێغەمبەرە

ئەگەر لە بنج و بنەوانی پێغەمبەرایەتی تێبگەیت، ئینجا بۆت دەر دەکەوێت کە هەموو رۆژێک پێغەمبەران لەدایک نابن، وە پێویست ناکات بۆ هەموو نەتەوەیەک لەهەموو چەرخێکدا پێغەمبەرێکی تایبەتی رەوانە بکرێت، چونکە ژیانی هەموو پێغەمبەرێك بریتیە لەژیانی پەیامو بەرنامەکەی، واتە: هەر پێغەمبەرێك پەیامو بەرنامەکەی زیندوبێت خۆیشی زیندووە، پێغەمبەرە زۆر پێشووەکان بۆیە بە نەماو دادەنرێن چونکە خەڵکەکە ئاینیان گۆڕیوەو زۆر شتی بێ بنەماو بە هەوەسیان تێکەل کردووە.

بەلاّم پێغەمبەرمان محمد (د.خ) هێشتا زیندووەو نەمردووە چونکە بەرنامەو پەیامەکەی لەبەردەستماندایەو بەتەواوی روونو ئاشکرایە، ئەوەتا قورئانی پیرۆز وەکو یەکەم جاری خۆی ماوتەوەو بە هیچ شێوەیەك گۆڕان رووی تێ نەکردووە، نەك رستەیەکی بەڵکو پیتێك لەپیتەکانی وە یا خاڵێك لەخاڵەکانی یان سەرو ژێرێکی بە هیچ شێوەیەك نەگۆڕاوەو وەکو خۆی ماوەتەوە، هەروەها ژیانی پێغەمبەر(د.خ) خۆیشی لەهەموو پەڕاوەکانو لاپەڕەکانی مێژوودا نوسراوەتەوەو پارێزگاری کراوە بە شێوەیەك دەڵێیت ئەمڕۆ چاومان لەخۆیەتیو لەناوماندا دەژیو بەگوێی خۆمان فەرمودەکانی ئەبیستین، کەس نیە لەجیهاندا وەکو پێغەمبەر (د.خ) رووداوەکانی ژیانی هەڵگیرابێت وە پارێزگاری کرابێت، لەبەر ئەوە زۆر باش دەزانین شوێنی بکەوینو پەیڕەوی لەفەرمانو فەرمودەکانی بکەین، وە تەنها ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزو تەواوە لەسەر ئەوەی کە مەردوم ئەمڕۆ پێویستیان بە ناردنی پێغەمبەرێکی دیکە نیە، وە ئەگەر پێغەمبەرێکی دیکە رەوانە بکرێت دەبێت لەبەر یەکێك لەم سێ هۆیانەی خوارەوە بێت:

**هۆی یەکەم-** ئەوەیە کە پەیامو بەرنامەی پێغەمبەری پێشوو نەمابێت وە پێویست بێت جارێکی دیکە نیشانی مەردوم بدرێتەوە.

**هۆی دووەم-** ئەوەیە کە پەیامو بەرنامەی پێغەمبەری پێشوو ناتەواو بێت پێویست بێت تەواو بکرێت.

**هۆی سێیەم-** ئەوەیە کە پەیامو بەرنامەی پێغەمبەری پێشوو تایبەت بێت بە گەلێکی تایبەتی وە گەلەکانو نەتەوەکانی دیکە پێویستیان بە ناردنی پێغەمبەرێکی دیکە بێت.

**و ئەمڕۆ ئەم سێ هۆیە هیچ کامیان بوونی نیە و دەست ناکەوێت.**

پــــەیامو بەرنامـــەی پێغەمبـــەر (د.خ) زینـــدووەو هێشـــتا لەبەردەســـتماندایەو لەبەرچاومانە، وە ئەو هۆیانەی کە ئەم پەیامو بەرنامەیەی پێ بناسین ئاشکرانو ئامادەن وە زۆر باش دەزانین کامەیە، ئەو شارەزایی و روناکیەی کە لەلایەن خوداوە هێناویەتی، وە دەزانین کام ریگەی بڕیار داوە کە لەژیاندا لەسەری بڕۆینو کامەیە ئەو ریگەیانەی کە خەڵکی لێ قەدەغە کردوە، جا لەبەر ئەوەی پەیامو بەرنامەکەی ئا بەم شێوەیە زیندووە هێشتا لەبەرستماندایە، کەواتە پێویست بەناردنی پێغەمبەرێکی دیکە ناکات، بۆ ئەوەی بۆ جاری دووەم نیشانی خەڵکی بداتەوەو بیخاتەوە بیریان.

خۆ ئەم پەیامو ئاینەی پێغەمبەر(د.خ) هیچ کەمو کوڕیەکی تێدا نیە هەموو روویەکی ژیانی گرتوەتەوە، لەبەر ئەوە پێویست بەوە ناکات شتێکی لێ کەم بکرێتەوە یان بخرێتە سەری، وە هەروەها ناتەواویەکی تێدا نیە کە پێغەمبەرێکی دیکە بێت بۆ تەواو کردنی، **بەم شێوەیە هۆی دووەمیش نەما**.

بێگومان پێغەمبەرێتی محمد (د.خ) بۆ هەموو جیهانە، وە تایبەت نیە تەنیا بە گەلێك یا تەنیابە کۆمەڵێك، وە یان بۆ چەرخێك نەك چەرخێکی دیکە، بۆیە هیچ نەتەوەیەك لەنەتەوەکانی جیهانو هیچ گەلێك لەگەلەکانی ئەم جیهانە پێویستیان بە ناردنی پێغەمبەرێکی دیکە نیە، **بەم شێوەیە هۆی سێیەمیش نەما**.

هەر لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەرمان (د.خ) ناوبراوە بە (خاتم النبیین) واتە پێغەمبەرێکە کۆتای هەموو پێغەمبەرەکانی دیکەیە.

کەواتە ئەمڕۆ پێویست نیە بە هاتنی پێغەمبەرێکی دیکە بە ئاینێکی نوێی دیکەوە، تەنها پێویستی هەیە بە هەندێك مرۆڤی باشو خواناس کە خۆیان بە جوانی شوێنی ئەم پێغەمبەرە بکەونو خەڵکیش بانگ بکەن بۆ ئەوەی لەم ئاینە شارەزا ببنو رەفتاری پێ بکەن، وە سەر لەنوێ بە ئەقڵێکی نوێوە ئیسلام جێبەجێ بکەنو بەگەلانی جیهانی بناسێنن.

## پرسیار:

**گرنگی باوەڕبوون بەوەی محەمەد (د.خ) کۆتا پێغەمبەرە لەچیدا دەبینێت ؟**

-١

-٢

-٣



## وانەی سێیەم:

# ئامانج لە ژیان و حەقیقەتی دونیاو دوارۆژو چارەنووسی مرۆڤ لە روانگەی ئیسلامەوە

مرۆڤی موسڵمان جیهان وەك یەكەیەكی یەكگرتوو دەبینێت، بونەوەر بەهەموو پێكهاتەكانی ناوی، لە خۆیانەوە دروست نەبون بەڵكو خودایەكی داناو بەتوانا دروستی كردوین، بونەوەر لەرێگەی كۆمەڵێك یاساو رێسای زانستیەوە دەجوڵێت، كەئەویش بەویستی خودای گەورە وكار بەجێیە، خودای گەورە بەبەردەوامی چاودێری جوڵەی هەسارەكان و بەردەوامی ژیان دەكات لەسەر گۆی زەوی، ئەگەر بۆ چاو تروكانێك خودای گەورە لەم بونەوەرە بێ ئاگابێت ئەوا هەموو جیهان دەوەستێت و هەموو یاساكانی گەردون وێران دەبن و هەرەس دەهێنن، مرۆڤی موسڵمان لەو باوەڕەدایە كە بونەوەر بەپێی سیستەمێكی زانستی بەڕێوە دەچێت و خودای گەورە بۆ ئامانجێكی پیرۆز دروستی كردوە، هەموو شتێك لەم بونەوەرەدا جوان و قەشەنگ و سەرنج راكێشەو هەر شتێكیش خودای گەورە بۆ حیكمەتێك دروستی كردووە، لەبەر ئەوە ژیانیش لەسەر گۆی زەوی كە دروست كراوە لەپێناو ئامانجێكی جوان و پیرۆزدایە.

## گەردونی ئامانجدار

ئێمە گەر سەیری هەر بەشێكی ئەم گەردوونە بكەین و بەجوانی لێی وردبینەوە، هەست دەكەین بۆ ئامانجێك بەدیهاتووەو بە گوێرەی یاسایەك دەڕوات بەڕێوە بۆ نموونە:

**ئـ** - ئۆكسجین و هایدرۆجین، دوو توخمی سروشتین و لە ریزی گازەكان دادەنرێن، هەریەكەیان خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەڵام كاتێك یەك گەرد لە ئۆكسجین لەگەڵ دوو گەرد لە هایدرۆجین یەك دەگرن، شتێكی نوێ پێكدەهێنن، كە ناوی ئاوەو مایەی مانەوەو بەردەوام بوونی ژیانە لەسەر زەویدا.

**ب** - ئەگەر خۆر لە زەویەوە نزیكتر یان دورتر بوایە ژیان لەسەر زەوی نەدەماو كۆتایی پێ دەهات، كەواتە خودایەكی بەدەسەڵات بۆ ئامانجێك خۆری لەو مەودایە لە زەویەوە دیاریكردووە.

پ – ئەگەر درەختەکان دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیان هەڵنەمژیایە، کە لە هەناسەدانەوەی زیندەوەرەکان و هەندێ کار لێکی دیکە پەیدا دەبێت و ئۆکسجینان نەدایەتەوە، ئەوا ئۆکسجین نەدەما، ژیان و مرۆڤ لەسەر زەوی کۆتاییان پێ دەهات، کەواتە درەختەکان ئامانجدارن.

ت – ئەگەر مانگ لەو دووریەی ئێستا هەیەتی لە زەوی دورتر بوایە، ئەوا شەپۆل لە زەریاو دەریاکاندا دروست نەدەبوو بەمەش بۆگەنیان دەکرد، خۆ ئەگەر نزیکتر بوایە، ئەوا بەهۆی زۆری هێزی کێشەکەیەوە رۆژانە دووجار زەوی ژێر ئاو دەکەوت و ژیانی تێدا نەدەما.

ح – ئەگەر بەرگە هەوای زەوی نەبوایەو رێگەی لە هەندێ تیشکی ژەهراوی نەگرتایە بگەنە سەر زەوی، ئەوا ئەو تیشکانە ژیانیان لەم زەویەدا کۆتایی پێ دەهێنا.

## بەشەکانی بونەوەریش هاوکاری یەکدی دەکەن بۆ ئەوەی ژیان و مرۆڤ لەسەر زەوی بەردەوام بن لێرەشەوە دەگەینە ئەوەی کە :

ئـ – هەر بونەوەرێك لە کۆمەڵێك بەشی تایبەت و دیاری کراو پێکهاتووە.

ب – ئەم بەشانە بەگوێرەی ئەندازە گیرەیەکی دیاری کراو بە تەنیشت یەکەوەن.

پ – هەر یەك لەم بەشانە تایبەتمەندییەکی تایبەت بەخۆیان هەیە لەگەڵ ئەرکی ئەوان گونجاوە.

ت – هەر بەشێك کارێکی دیاریکراو ئەنجام دەداو ئەرکێکی لە ئەستۆدایە.

ح – ئەم ئەرك و کارانە لە نێوان یەکدیدا لە پەیوەندیدان و بەیەکەوەو بەهاوکاری یەکدی مانا دەبەخشن و ئامانجەکان بەدی دەهێنن.

## ئەركی قوتابی:

هەندێك نموونە لە بونەوەردا بێنەرەوەو باسی خاسیەتو ئەركەكانیانو جۆری ئەو پەیوەندییەی لە نێوانیاندا هەیە بكە.

## پرسیار :

چ نموونەیەك بەڵگەیە لەسەر بوونی یاسا لە بونەوەردا؟

- چۆن سەیری ئەوكەسانە دەكەیت كەوا دەزانن ئەم بونەوەرە بێ ئامانجەو هەروا بێ هودە دروست كراوە؟

- لە هاوكاری نێوان بەشو پارچەكانی بونەوەر بۆ گەیشتن بە ئامانجەكان چی فێر دەبین؟

- بوونی یاساو ئامانج لە هەموو پارچەو بەشەكانی بونەوەردا بەڵگەی چین؟

- بەگشتی لەم وانەیەدا، لەم خاڵانەی خوارەوە تێگەیشتین:

١-

٢-

٣-

٤-

## وانەی چوارەم:

# راستی مـــرۆڤ

بەهای هەر کەسێك پەیوەستە بە تێگەیشتنی ئەو لە حەقیقەتی بوونو پێگەو پلەو پایەی مرۆڤ لە بونەوەرەدا، پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) خودا لێی رازی بێت لە وتەیەکی خۆیدا ئاماژە بەم مەسەلەیە دەکاتو دەفەرموێت:((**خودای گەورە بەزەیی خۆی بەسەر ئەو کەسەدا بڕژێنێت کە بزانێت لە کوێوە هاتووەو ئێستا لە کوێیەو بەرەو کوێ دەچێت**؟)).

**لێرەدا جێی خۆیەتی لە خۆت بپرسێت:**

- **من کێم؟**
- **شوێنو جێگەو پێگەم لە بونەوەردا لە کوێدایە؟**
- **لە کوێوە هاتومو بەرەو کوێ دەچم؟**
- **لای کێ هاتومو بۆلای کێ دەگەڕێمەوە؟**

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بۆ مرۆڤ زۆر گرنگە، بۆ ئەوەی خۆی بناسێتو ڕێبازی ژیانی خۆی دیاری بکاتو بزانێت چی دەکاتو چی ناکات؟ ئێمە هەموومان لەلایەن خوداوە هاتووینو ئەو بەدیهێناوین((هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم))(الانعام ٢) **واتە:** ئەو خودایەی کە ئێوەی بەدیهێناوە، کە هاتووین لەم ژیانەدا لە تاقیکردنەوەداینو ئەرکمان ئەنجامدانی کاری باشە لەم ژیانە، دوای بەسەربردنی ژیانی ئەم دونیایەش دەگەڕێینەوە بۆ لای پەروەردگار ((وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ))(البقرة ٢٨١).

**واتە:** لە ڕۆژێك بترسن و حیسابی بۆ بکەن کەتیایدا دەگەڕێینەوە بۆ لای خوداو لەسەر ژیانی ئەم دونیایە لێتان دەپرسێتەوە.

## پلەو پایەی مرۆڤ لەلای خودای گەورە:

مرۆڤ پلەو پایەیەکی یەکجار گەورەی لای پەروەردگار هەیە، پلەو پایەیەك کە فریشتەکانی خودا لە بەرامبەر ئەوەوە دەستە وەستان بوون . مرۆڤ هێندە مەزنە کە خودای گەورە بەجێنشین لەم زەویەدا ناوی دەبات:(( وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ))(البقرة ٣٠).

**واته:** کاتێك خودای گەورە بە فریشتەکانی گوت جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم تا ئاوەدانی بکاتەوە، فریشتەکان وەڵامیان دایەوە: تۆ یەکێك دەکەی بە جێنشین لە زەویدا (واتە مرۆڤ) کە خراپەکاری تێدا بکات و خوێن بڕێژێت، لە کاتێکدا ئێمە تۆ بەپاکی و بێ خەوش ڕادەگرین و سوپاسگوزاریت دەکەین و بە پیرۆزت دەزانین؟ بەڵام خودای گەورە وەڵامی دانەوە من هەندێك شت دەزانم کە ئێوە نایزانن .

لەم ئایەتەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە خودای گەورە تواناو ئامادەییەکی بێ سنوری بەدەستهێنانی زانست و زانیاری بە مرۆڤ بەخشیوە، بەجۆرێك کە دەتوانێت خودی خۆی و ڕاستییەکانی جیهانی پەیوەست بەخۆی بناسێت و خودای گەورەو ناوو ئاوەڵناوەکانی بناسێت و بیپەرستێت و خۆشی بوێت و پشتی پێ ببەستێت.

خودای گەورە دەفەرموێت:((وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾))(البقرة٣١-٣٣).

**واته:** خودای گەورە هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد، دوای ئەوە بۆ فریشتەکانی خستە روو فەرمووی لەناوی ئەوانە ئاگادارم بکەنەوە گەر ڕاست دەکەن، فریشتەکان وتیان: خودایە تۆ لە هەموو کەم و کورتی و ناتەواویەك بەدوری و ئێمە زانیاریەکمان نیە جگە لەوەی خۆت فێرت کردووین و پێت بەخشیوین، بەڕاستی تۆ زاناو کاربەجێت.

فەرمووی ئەی ئادەم لەناوەکان ئاگاداریان بکەرەوە، کاتێك ناوەکانی پێیان ڕاگەیاند خودای گەورە فەرمووی: ئایە من بە ئێوەم نەوت کە ئاگام لە پەنامەکی و شتە شاراوەکانی ئاسمانەکان و زەویە، وە ئەوەی ئاشکرای دەکەن یاخود دەیشارنەوەو دەرینا خەن دەیزانم؟

خودای گەورە لەم ئایەتانەدا بەشێك لە تواناو سروشتی مرۆڤمان پێدە ناسێنێت کە ئەویش توانای فێربوون و ناسین و دۆزینەوەی ڕاستیەکان و دروستکردنی شارستانی و ئاوەدانکردنەوەی سەر زەویە، کە ئەم شتانە بەو جۆرە لە فریشتەکاندا بوونی نیە، چونکە ئەوان بۆ ئامانجێکی دیکە بە دیهاتوون، خودای گەورە مرۆڤی بە جۆرێك خوڵقاندووە کە توانای بە ئەنجام گەیاندنی ئەرکی جێنیشینیەتی هەبێت.

لێرەشەوە دەگەین بەو ڕاستییەی کە بەشێك لە گەورەیی مرۆڤ پەیوەندی بە ئاستی تواناو ئامادەیی ئەوەوە هەیە بۆ فێربوون و بەدەستهێنانی زانست و

بەکارهێنانی خێروبێرەکانی زەوی و ئاسمانەکان لە بەرژەوەندی خۆی و گەشەپێدانی ژیانی مرۆڤایەتی.

لە بەرامبەریشدا هەر فیکرو سیاسەت و بۆچوون و کلتورو داوایەك دژی ئەوەبێت مرۆڤ فێربێت و زانست وەربگرێت و خۆی و بونەوەر بناسێت و بە نەزانی و دواکەوتوویی بمێنێتەوە، ئەوا دژی ویستی خودای گەورەو پێچەوانەی ئەو حاڵە راست و دروستەیە، کە خودای گەورە بۆ مرۆڤی دەوێت، خودای گەورە لە ئایەتێکیشدا (زانیار)ی دەکات بە پێوەری رێزدانان و دەفەرمووێت:(( قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ)) (الزمر٩) ئایە زاناو نەزانەکان یەکسانن وەك یەك وان؟

بێگومان یەکسان نین و ئەوانەی زانان و زانستەکەیان بۆ خزمەتی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بەکاردەهێنن وەبەشێوەیەکی راست و دروست خودا دەناسن خاوەن پلەو پایەیەکی بەرزترن.

پێغەمبەریش (د.خ) لە چەندین فەرموودەی خۆیدا هانی باوەڕداران دەدات بۆ فێروبوون و بەدەستهێنانی زانست هەر وەك دەفەرمووێت (**اطلب العلم من المهد الى اللحد**).

**واتە:** بەدوای زانستدا بگەڕێ و هەوڵی بەدەسهێنانی بدە هەر لەسەر پشتی لانکەوە تا ناو گۆڕ، واتە سەراپای ژیانت بکە بە زنجیرەیەکی نەپساوە لە بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاری و هۆشیاری خۆت، وە دەفەرمووێت :((**طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة**)) داواکردنی زانیاری و هەوڵی بەدەستهێنانی ئەرکی سەرشانی هەموو ژن و پیاوێکی موسڵمانە، ئەم فەرموودەیەش بێ بەش کردنی ئافرەتان لە خوێندن و فێربوون و خۆ پێگەیاندن و بەدەستهێنانی زانیاری دەکات بە تاوان و سەر پێچی کردن لە فەرمانی پێغەمبەری ئیسلام . چونکە کاتێك خودای گەورە مرۆڤی کردووە بە جێنشین رەگەزی مرۆڤی کردووە، نەك تەنها پیاوان، بەڵکو بە حوکمی ئەوەی ژن و پیاو هەردووکیان لە مرۆڤ بوون و ئینسانی بوندا یەکسانن و کەسیان رێزی بەسەر ئەوەی دیکەدا نیە، کەواتە بەسروشتی حاڵ بڕیارەکە ژن و پیاو وەك یەك دەگرێتەوە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ژنانیش وەك پیاوان دەبێت خۆیان بە زانست و زانیاری چەکدار بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن ئەرکی جێنشینی بەجوانی ئەنجام بدەن.

بۆیە هەر جیاوازی کردنێك لەم رووەوە لە نێوان ژن و پیاوداو رێگرتن لەوەی ئافرەتان پەرە بە تواناکانیان بدەن و خۆیان پێش بخەن، پێچەوانەی بۆچوون و دیدی

ئیسلامە بۆ مەسەلەی جێنشینی مرۆڤ ، بەگشتی مرۆڤ کاتێك هەست بەوە دەکات خودای گەورە کردویەتی بە جێنشینو ئەو ئەرکە گەورەیەی خستۆتە سەرشانی، هەست بە گەورەییو رۆڵو پلەو پایەی خۆی لەم ژیانو جیهانەدا دەکات، هەوڵیش دەدات رێز لەو پلەو پایەیە بگرێت کە خودای مەزن پێی بەخشیوەو، بە شێوەیەك بیر نەکاتەوەو نەژی و رەفتار نەکات کە لە گەڵ ئەو گەورەییەدا ناگونجێتو سازگار نیە .

## دیالۆگ:

پلەو پایەی جێنشینی مرۆڤ بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەویو بەرەوپێش بردنی ژیان چی دەگەیێنێتو چیە؟

مرۆڤ چ تایبەتمەندییەکی تێدایە شایستەی ئەو پلەو پایەیە بێت؟

## وانەی پێنجەم:

## مرۆڤ خاوەن کەرامەتی خودا پێبەخشراو

لە روانگەی ئیسلامەوە مرۆڤ بەدیهێنراوێکی بەڕێزی خودای گەورییە، هەر ئەوەیش کەرامەتی پێ بەخشیوە، بۆیە دەبێت مرۆڤ بەتایبەتیش مرۆڤی باوەڕدار هەست بەو کەرامەتو ڕێزە بکات، خودای گەورە لەم رووەوە دەفەرموویێت: ((ولقـد كرَّمنـا بَـنى آدَمَ وَحَمَلْناهُم فى البَرِّ والبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِنَ الطَّيِّباتِ وَفَضَّلْنَاهُم عَلَى كَثيرٍ مِمَّـنْ خَلَقْنَـا تَفْضِـيلاً)) (الاسراء ٧٠)

**واتە:** بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە مرۆڤ گرتووەو کەرامەتمان پێ بەخشیوە، وە ئەوانمان لە دەریاو وشکانیدا لە ئەستۆ گرت رزق و رۆزی پاکمان پێ داون و ڕێزو فەزڵمان داون بەسەر زۆربەی هەرە زۆری ئەو بونەوەرانەی بەدیمان هێناون، لەم ئایەتەدا خودای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە ئەو چۆن سەیری مرۆڤ دەکات و تێمان دەگەیەنێت کە ئەم بونەوەرە لە لای ئەو زۆر بەڕێزەو خۆشی دەبێت ڕێزی خۆی لابێت و بۆ هیچ هێزو کەس و لایەنێکیش نیە بێ ڕێزی بەرامبەر بکات و سوکایەتی پێ بکات.

دواتر خودای گەورە ئاماژە بەهەندێك لە رواڵەتەکانی ئەو رێزلێنانەی خۆی دەکات کە چۆن لە دەریاو وشکانیدا یارمەتی دەدات وە رزق و رۆزی و سەرچاوەی ژیانی جۆراوجۆری خستۆتە بەردەستی، بەچەشنێك هەرچی لەم بونەوەرەدا لە رووەك و زیندەوەرو گیانلەبەران، بەجۆرێك لە جۆرەکان لە خزمەت مرۆڤدان و خزمەتی ئەو دەکەن، دوایش ئەوەمان بیر دێنێتەوە کە مرۆڤ لە ریزی بەرزترین بەدیهنراوەکانی خودای گەورەیەو ڕێزی بەچەندین بەهرەو بەخشش و توانای پێ بەخشیوە، فەزڵ و ڕێزی داوە بەسەر زۆربەی بونەوەرەکانی دیکەدا.

### خودای گەروە مرۆڤی بە چ جۆرێك بەدیهێناوە؟

خودای گەورە مرۆڤی بە جۆرێك بەدیهێناوە کە توانای جیاکردنەوەی شتە جوان و ناشیرینەکانی هەبێت، وە ئەگەر رووی کردە چاکەو خێرو شتە پاك و جوانەکان لە دەرونی خۆیدا هەست بە گەورەیی و ئاسودەیی بکات، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر رووی لە خراپەو رەفتارو ئاکارە ناشیرینەکان کرد بتوانێت سەرزەنشتی خۆی بکات و هەوڵی

خۆ راستکردنەوە بدات، خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێت:((وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۝٨))(الشمس ٧و٨).

**واتە:** سوێند بە نەفسو ئەو کەسەی رێکی خستووە، وە ئیلهامی چاکەو خراپەی پێ بەخشیوە، لەم ئایەتانەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە مرۆڤ بونەوەرێکی تایبەتیە، نە فریشتەیەو نە شەیتان. چونکە فریشتە ناتوانن لە فەرمانی خودای گەورە دەربچن و یەك پارچە روناکیو خێرو چاکەو رەمزی پاکیو بێ تاوانین. لە بەرامبەریشدا شەیتان رەمزی خراپەو تاوانە. بەڵام مرۆڤ لەو نێوەندەدایەو سیفاتی چاکەو خراپەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە. مرۆڤ بەتایبەتیش مرۆڤی موسڵمانو باوەڕدار دەبێت ئاگاداری خۆی بێتو هەوڵی پەروەردەکردنی خۆی بداتو خۆی فەرامۆش نەکات، بۆ ئەوەی لە رێی ئاگابوون لە خۆو جوان تێگەیشتن لە ئیسلامو شتە جوانەکانی مرۆڤایەتی بەگشتیو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ژینگەیەکی وا کە لەسەر چاکەو خێر هانی بدات، هەوڵی پەرەدان بە سیفەتە جوانو فریشتەییەکانی ناو دڵو دەرونی بداتو بەمەش ببێتە مرۆڤێکی چاکەخوازو خێرخوازو دادپەروەری خوازو دژی شەڕو خراپەو ستەمو زۆرداری رەوشتی ناشیرینو نزم بێت. لێرەوە تێدەگەین کە هەموومان بەرامبەر خۆمانو ئەقڵو نەفسی خۆمان لێپرسراوینو دەبێت ئاگامان لەو لێپرسراوێتیە ببێت.

## کەرامەت و گەورەیی مرۆڤ لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت ؟

ئەو تایبەتمەندیو پلەو پایەی مرۆڤ لە لای خودای گەورە و لەم جیهانە و لە نێو بونەوەرەکانی دیکەداو ئەو هەموو قەدرو رێزەی هەیەتی لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت ؟

لە راستیدا هەموو ئەو رێزو کەرامەتە لەو گیانەدایە کە خودای گەورە پێی بەخشیوەو هەر بە هۆی ئەویشەوە زیندووە.

کاتێك خودای گەروە مرۆڤی لەم خاکەو کەرەستەکانی سروشت دروستکرد، گیانی پێ بەخشیو بەهۆی ئەم گیان پێ بەخشینەشەوە، ئەو توانا و قەدرو رێزەی تێدا ئاشکراکرد خودای گەورە لەم روەوە دەفەرموێت:(( إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ ۝٧١ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ ۝٧٢ )) (ص ٧١- ٧٢).

**واتە**: کاتێك خودای گەورە بە فریشتەکانی گوت: من مرۆڤ لە گڵ بە دیدەهێنم، کاتێك ئەوم رێكو راست کردو رێکم خستو لە گیانی خۆم پێ بەخشی، بچنە کڕنووشەوەو کڕنووشی بۆبەرن، بیر هێنانەوەی خودای گەورە بۆ ئێمە کە لە خاك دروستکراوین زیاتر لە ئاماژەو وانەو پەندێکی تێدایە. لە روویەکەوە دەسەڵاتو گەورەیی خودامان بۆ دەردەخات،

لە ڕوویەکی دیکەوە تێمان دەگەیەنێت کە لە بنەڕەتدا هەموو مرۆڤەکان یەکسانن‌و لە یەك کەرەستەو سەرچاوە دروست بوون و یەك بەدیهێنەرو خاوەن‌و پەروەردگاریان هەیە.

لە ڕووەیەکی دیکەوە ئەم ئایەتانە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە مرۆڤ بەهەناسەی خوداو بەو گیانە دەژی کە خودا پێی بەخشیوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گیانی خودای گەورە لە مرۆڤدا ئامادەیە بۆیە هەر بێ ڕێزیی‌و بە سوك سەیرکردن‌و ستەم لێکردن‌و زۆرکردنێك لە مرۆڤ، تاوانێکی گەورەیەو ڕێز نەگرتنە لە گەورەیی‌و پیرۆزی خودای گەورە.

خودای گەورە پلەو پایەی مرۆڤی گەیاندۆتە ئاستێك کە فریشتەکان لەگەڵ هەموو ئەو پاکی‌و نزیکیەیاندا لەخودا کڕنووشی بۆ ئادەم پێ بردوون. لە کاتێکدا نابێت جگە لە خودا کڕنووش بۆ کەسی دیکە ببردرێت‌و ئەمە کڕنۆشی ڕێزەو بە فەرمانی خودای گەورە خۆی بووە.

## گفتوگۆ:

بۆچی هەندێکجار مرۆڤ، یاخود زۆرێك لە مرۆڤەکان، هەست بەم پلەو پایە بەرزەی خۆیان ناکەن‌و بەجۆرێك ڕەفتار دەکەن کەشایستەی پلەو پایەی خۆیان‌و گەورەیی خودا نیە؟

## پرسیار:

مرۆڤ چۆن بتوانێت هەست بە گەورەیی‌و ڕێزی خۆی بکات‌و ڕەفتارێك نەنوێنێت پێچەوانەی ئەوە بێت؟

وانەی شەشەم:

## مرۆڤ و سەرچاوەکانی تاوان

لەگەڵ ئەوەدا کە خودای گەورە ئەو هەموو ڕێزەی بەمرۆڤ بەخشیوە وە بەهای باڵای لە بوونی ئەودا داناوە، کە مرۆڤ هاندەدات بەرەو چاکیو پاکیو بڵندی، ئەی بۆچی سەرەڕای هەموو ئەو شتانە هەندێك لە مرۆڤەکان دەست دەدەنە خراپەو تاوانو ڕێگەی چاکەکاریو ڕەوشتو ئاکاری بەرزو خواناسانەیان لێ تێکدەچێت؟

دۆزینەوەی سەرچاوەو هۆکاری ئەم لادانو تاوانانە یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی لە خراپەو تاوان بەدووربینو گیانمان ئاسودەو ژیانمان بەختەوەربێتو ڕێگە نەدەین فریو بخۆین، یاخود فریو بدرێین.

گەر سەیری قورئانی پیرۆزبکەین، دەبینین خودای گەورە باسی زۆرێك لە هۆکارو سەرچاوەکانی لادانی مرۆڤو تاوانی بۆ کردووین، بەشێك لەوانەش بەم جۆرەی خوارەوەیە:

### ئ – هەست نەکردن بە نزیکی خودای گەورە لێمانەوە:

خودای گەورە هەمیشە لەگەڵماندایەو چاوی لێمانەو لێمانەوە نزیکەو ئاگای لە هەموو هەڵسو کەوتێکمان هەیە، هەروەك دەفەرمووێت:(( وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ﴿١٦﴾)) (ق ١٦).

**واتە:** ئێمە مرۆڤمان بەدیهێناوە، وە ئاگامان لەوەیە چ خەتەرەو وەسوەسەیەك بە دەرونیدا دێتو لە دڵی خۆیدا بیر لە چی دەکاتەوە. ئەگەر مرۆڤی موسڵمان ئەم ڕاستییەی بیر نەچێتەوە کە خودای گەورە ئاگای لە ناخی دڵو دەرونی هەیەو هیچ شتێك لەو شاراوە نیە، وە هەتا بڵێت لێی نزیکە، ئەوکاتە هەست بەچاودێری ئەو دەکاتو ئەمەش لە هەڵەو تاوانو خراپەکاری دەیگێڕێتەوە.

### ب – خۆشەویستی زۆری ئەم دونیایەو لە بیر بردنەوەی زیندوبوونەوە و دوا ڕۆژ:

خودای گەورە دەفەرمووێت:( كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ ﴿٢١﴾) (القيامة ﴿٢٠﴾- ﴿٢١﴾).

**واتە:** نەخێر مەسەلەکە بەو جۆرە نیە، بەڵکو ئەوەیە کە ئێوە ئەم دونیا زوو تێپەرەتان خۆش دەوێتو وازتان لە جیهانەکەی دیکەو دوا ڕۆژ هێناوە.

هەڵبەت لە ئیسلام قەدەغە نیە مرۆڤ دونیاو ژیانی دونیای خۆشبوێت و هەوڵی ژیانێکی پڕ لە خۆشگوزەرانی بدات، بەڵکو ئەوەی بەخراپە دانراوە بریتیە لەوەی مرۆڤ هەر بیر لەم دونیایە بکاتەوەو دوارۆژو زیندووبوونەوە فەرامۆش بکات و کار بۆ ئەوە نەکات کە جیهانێکی دیکە هەیەو مرۆڤ تیایدا زیندوو دەبێتەوەو لەسەر کردەوەکانی لە ژیانی ئەم دونیایەدا لێی دەپێچرێتەوە.

### پ – بێ ئاگابوون لە پیلانەکانی شەیتان و شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی:

هەروەك دەزانین خودای گەورە پێی ڕاگەیاندووین کە شەیتان دوژمنی مرۆڤە:(( إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا))(فاطر٦). **واتە:** شەیتان دوژمنی ئێوەیەو ئێوەش بە دوژمنی بزانن.

خودای گەورە لە چەندین ئایەتی دیکەدا لە بەرامبەر فێڵ و نەخشەو شێوازەکانی شەیتان بۆ لە ڕێ لادانی مرۆڤ ئاگادارمان دەکاتەوە، هەروەك دەفەرموێت:(( يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي الأَرْضِ حَلاَلاً طَيِّباً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاء وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴿١٦٩﴾)) (البقرة ١٦٨-١٦٩).

**واتە:** ئەی خەڵکینە لەو شتە حەڵاڵ و پاکانەی لە زەویدایە بخۆن، وە شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە ئەو دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە، ئەو فەرمانتان پێ دەکات بە خراپەو کاری ناشیرین و قێزەون: وە شتێك دەربارەی خودا بڵێن کە زانیاریتان لە بارەیەوە نیەو نایزانن.

لێرەوە تێدەگەین کە خراپەو تاوان کردن و لە ڕێ لادان، جێبەجێکردنی فەرمانی شەیتانە لە کاتێکدا باوەڕدار دەبێت فەرمانی بەدیهێنەرو پەروەردگارەکەی جێبەجێبکات و بەگوێی کەسێك نەکات کە خودای گەورە لە دلۆڤانی خۆی بێ بەشی کردووەو کاروپیشەی هاندانی بەندەکانی خودایە بۆ خراپەو تاوان.

## پرسیار:

چی بکەین بۆ ئەوەی خۆمان لە خراپەو تاوان دووربخەینەوە؟

## دیالۆگ:

چ هۆکارێکی دیکە هەیە بۆ لە ڕێ لادانی مرۆڤ و پاڵپێوەنانی بۆ خراپە؟

## وانەی حەوتەم:

# داوەکانی شـــەیتـــان

شەیتان کە دوژمنی مرۆڤەو خۆی لەو بە گەورەتر دەزانێت، سوێندی خواردووە کـە بەنـدەکانی خـودای گـەورە لـە ڕێگـەی ڕاسـت لابـداتو فریویـان بـداتو تۆڵـەی دەرکردنی لە بارەگای خودایان لێ بکاتەوە، کاری ئەو دروستکردنی وەسوەسەو وادەو بەڵێنی درۆیە.

ئـامرازی دەستیشـی هـەواو هـەوەسو ئارەزووەکـانی مرۆڤـە، کـە دەیـەوێت لـەم ڕێگەیەوە مرۆڤ لە خشتە بەرێتو هیواو ئامانجی پوچ بخاتە مێشکیەوە، سەرەنجام دوچاری چـەندین ئـازارو دەردەسـەریو ناڕەحـەتی ئـەم دونیـاو ئـەو دونیـای بکـات، شەیتان بە چەندین شێواز دژ بە مرۆڤ کار دەکاتو بۆ ئەنجام دانی تاوانو سەرپێچی کردنی فەرمانی پەروەدگار هانی دەدات، لەوانەش:

**١- ڕازاندنەوەو جوان نیشاندانی تاوانو خراپە.** هەر وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ((وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ))(الأنعام ٤٣). **واتە:** شـەیتان کـارو کردەوەکـانی بـۆ ڕازاندنەوە.

**٢- سـەرگەرم کردنـی مرۆڤـەکان بەهـەواو هـەوەس ئـارەزووی دونیاییـەوە .** هـەر وەك خودای گەورە دەفەرمووێت :(( اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُوْلَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ)) (المجادلة ١٩).**واتە:** شـەیتان دەسـتی بەسەر دڵو دەرونیاندا گرتووەو خستونیە، ژێر هەژمونی خۆیـەوەو یـادی خـودای لـە بیر بردنـەوە ئەوانـەی واشیان لێ هاتبێت دۆسـتو لایـەنگری شـەیتانن، بـەڵام بەڕاسـتی دۆستانو لایەنگرانی شەیتان دۆڕاوو زەرەرمەندن.

**٣- بێ ئاگاکردنی مرۆڤ لە یادی خوداو ئەو کارانەی کەوا دەکەن مرۆڤ خودای لەبیر نەچێت وەکو نوێژ وە چاندنی تۆوی ڕقو کینەو دوژمنایەتی لە نێوان مرۆڤەکاندا.** هەر وەك خودای گەورە دەفەرمووێت:(( إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾)) (المائدة ٩١).

**واتە:** شەیتان لـە ڕێـی مـەی خواردنـەوەو قومـار کردنـەوە دەیـەوێت دوژمنایـەتیو ڕقو کینە بخاتـە نێوانتانـەوە وە ڕێگریتـان لـە یـادی خـوداو نوێـژکردن لێ دەکـات. جا داخـۆ ئێوە واز لە خواردنەوەو قومار دەهێننو کۆڵیان لێ دەدەن؟

بۆیە مرۆڤ دەبێت ئاگاداری ئەو ڕێگەو شێوازانە بێتو بەگوێی شەیتان نەکاتو نەچێتە داوی ئەوەوە. چونکە دوایی جگە لە پەشیمانی هیچی دیکەی بۆ نامێنێتەوە. لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین کە شەیتان ناتوانێت بەسەر باوەڕداری ڕاستەقینەدا سەربکەوێت . کاتێك مرۆڤیش لە خشتە دەبات دوایی لە دواڕۆژدا خۆی لێ بەری دەکاتو دەڵێت ئەوە خەتای خۆی بووەو من هیچ دەسەڵاتێکم بەسەر ئەودا نەبووە. ئەو خۆی لاواز بووەو بە گوێی منی کردووە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: (( وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الأَمْرُ إِنَّ اللّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلاَّ أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي فَلاَ تَلُومُونِي وَلُومُواْ أَنفُسَكُم مَّا أَنَاْ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنتُمْ بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)) (ابراهيم ٢٢).

**واتە:** کاتێك کار تەواو بوو شەیتان دەڵێت: خودای گەورە بەڵێنی هەقو ڕاستی پێ دان، منیش بەڵێنم پێدان، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەوە جوڵامەوەو کارم بە بەڵێنەکانم نەکرد، من هیچ دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا نەبوو، تەنها ئەوەندە نەبێت کە بانگی ئێوە بکەمو ئێوەش وەڵامی بانگەکەتان دامەوە. کەواتە سەرزەنشتی من مەکەنو سەرزەنشتی خۆتان بکەن، ئێستاش نەمن بەفریای ئێوە دەکەومو نە ئێوەش بە فریای من دەکەون، من بێ باوەڕم بەوەی ئێوە هاوبەشتان بۆ خودا پەیداکرد ستەمکاران سزای بەسوێیان هەیە.

دیارە هیچ مرۆڤێکی زیرەكو هۆشیارو خەمخۆر بۆ چارەنووسو دواڕۆژی خۆی، ڕوو بە ڕووی ئەو چارەنووسە نابێتەوە.

## گفتوگۆ:

١- بیر لە ئایەتی (٢٢)ی سورەتی ئیبراهیم، بکەرەوەو ڕۆڵی شەیتان لە گومڕاکردنی مرۆڤ ڕونبکەرەوە.

٢- چ پەندێك لەم گفتوگۆیە وەردەگریت؟

## وانەی هەشتەم:

## ئازادی مرۆڤ لە هەڵبژاردنی ڕێگای چاکە یان ڕێگای خراپە

قورئانی پیرۆزو فەرموودەش جەخت لەوە دەکەنەوە کە هۆکاری بنەڕەتی تاوانو خراپە مرۆڤ خۆیەتی. هەر بۆیە هیچ مرۆڤێك لە دواڕۆژدا ناتوانێت تاوانی خۆی بەسەر شەیتاندا بداتو خۆی رزگار بکات .

بەم جۆرەش مرۆڤەکان دەبن بە دوو دەستەوە: دەستەیەك رویان لە خوداو بەرزیو کاری چاکەو دەستەکەی تریان چاویان لە نزمیو خراپەیە، هەرکەس ڕێگایەکی بۆ خۆی دیاریکردووە، خودای گەورەش دەفەرموویێت:(( إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا)) (الانسان ٣).

**واتە:** ئێمە ڕێگەی راستمان پێشانی مرۆ ڤ داوە، مرۆڤەکانیش یا ڕێگەی راست دەگرنو بەمەش سوپاسگوزاری خودای گەورە دەبن، یاخود ئەو ڕێگەیە ناگرنو سوپاسگوزاری ناکەنو بەرامبەر بە پەروەردگاریان وەفادارنابن،خودای گەورە لەم رووەوە سەرنجامی چاکەو سوپاسگوزاریو خراپەو بێ وەفایی روون کردۆتەوە، پاشان ئازادی تەواوی بە مرۆڤەکان داوە چ ڕێگەیەك هەڵدەبژێرنو بۆ هیچ هێزو دەسەڵاتێك نیە زۆریان لێ بکات، چونکە لە ئیسلامدا باوەڕهێنان ئازادەو زۆر لێکردنی تێدا نیەو مرۆ ڤ بەویستو ئیرادەی ئازادی خۆی ڕێگەی ژیانی خۆی دیاری دەکات، تەنها ئەوەیە مرۆ ڤ دەبێت ئەوە بزانێت کە هەڵبژاردن لێپرسراوێتیەو لە لای خودای گەورە لە جۆری هەڵبژاردنەکە لێی دەپرسێتەوە.

قورئان لەم رووەوە دەفەرموێت:(( وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاء كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءتْ مُرْتَفَقًا)) (الکهف ٢٩).

**واتە:** هەر کەسێك دەیەوێت با باوەڕبێنێتو هەرکەسێکیش دەخوازێت با بێ باوەڕبێت.

بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا مرۆ ڤ دەبێت لە هەڵبژاردنی ڕێبازی ژیانی وردبێتو جوان بیری لێ بکاتەوە، چونکە چارەنووسی ئەم دونیاو ئەو دونیای پێوە

بەستراوەتەوە، چاکە یارمەتی لە خەڵکانی شارەزاو چاکەکاریش وەربگرێت بۆ ئەوەی بڕیارێکی باشتربدات.

لە رواڵەتیشدا رێگەی خراپەو تاوانو بەرەو خوارچوون ئاسانە بۆ مرۆڤ ،هەر چەندە هەندێك ناڕەحەتی تێدایە. بەڵام ئەگەر بەچاوی عەقڵ سەیری شتەکان بکاتو بیر لەو چارەنووسە بکاتەوە کە چاوەڕێی مرۆ ڤ دەکات ئەوا رێگەی بەرەو سەرچوونەکە هەڵدەبژێرێت چونکە بەختەوەریو سەر بەرزی لەودایە.

چارەنووسی مرۆڤیش لە دواڕۆژدا بە یەك بڕیارەوە پەیوەستە، بڕیارێك کە دەبێت خۆی بیدات، عەقڵی بکات بەدادوەرو بیر بکاتەوە، گفتوگۆ بکاتو تاوتوێی مەسەلەکە بکاتو ئیرادەی خۆی بە گەڕ بخاتو بڕیار بدات، بۆ ئەوەی رێگەی باوەڕو چاکەو خزمەتو سەربەرزی هەڵبژێرێت.

## پێشنیار:

کەحاڵەتی مرۆڤ لە نێوان دوو رێگەکەدا پرسیارو لێکۆڵینەوە بێت : ئەو هۆکارانە چین وا لە مرۆڤ دەکەن رێگەی باوەڕو سوپاسگوزاری پەروەردگار بگرێتە بەر؟

## دیالۆگ:

رۆڵی هاوڕێ لە رێنیشاندان یاخود گومڕاکردنی مرۆڤدا چیە؟

## وانەی نۆیەم:

# مرۆڤ و کۆمەڵێک سیفاتی گرنگ

خـودای گـەورە کۆمـەڵێك سـەرمایەی گرنگـی بـە مـرۆڤ بەخشـیوە، کـە دەتـوانن یارمەتیدەری بن لە دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاستو شوێنکەوتنی:

### ١- سروشتی خواناسانە (**الفطرة**):

مرۆ ڤ سروشتو (**فطر**)ەیەکی هەیە بەخودا ئاشنایەو ڕووی لە پەروەردگارەو خودای گەورە بەسەرچاوەی چاکیو پاکیو جوانییەکان دەزانێت.

لە قوڵایی دڵو دەروونو ناخی مرۆڤدا هەستێك هەیە بانگی دەکات بۆلای ناسینی خودای گـەورەو پەرستنی، هـەموو مرۆڤێك کە لـە دایـك دەبێت بـەم هەسـتەوە لـەدایك دەبێـت، بـەڵام زۆرجـار خێـزانو کۆمەڵگـەو کلتـور ئـەو هەسـتە کـپ دەکـەنو نـاهێڵن بگەشێتەوەو ژیانی مرۆ ڤ بەخواپەرستیو خۆشەویستی خوداو رووکردنە ئەو روناك بکاتەوەو تەڕو پاراوی بکات.

### ٢- هۆگربوون بە بەها پیرۆزەکان:

خودای گەورە سەرچاوەی هەموو جوانیو بەهاکانە دوای ئەوەی مرۆ ڤ باوەڕ لە دڵیدا دەچەسپێتو عەشقی خودا دەرونی داگیر دەکات، هۆگری چەندین بەهای باڵاو جوانی وەکو:(سۆزو بەزەیی، کەرامەت، ڕاستگۆیی، دادپەروەری، لێبوردەییو سینە فراوانـی) دەبێتو سەرەنجام لە خراپەو ڕەفتارە دزێوەکانی وەکو:(بـەخیلی، دوڕوویـیو ستەم) بێزار دەبێت.

### ٣- ویژدانی ئەخلاقی:

خودای گەورە شتێکی بەمرۆ ڤ بەخشیوە کە پێی دەوترێت ویژدانی ئەخلاقی، کە ئەو هەستەیە مرۆ ڤ لـە تـاوانو کرداری ناڕەوشـتی دەگێڕێتـەوە وەئەگـەر مـرۆ ڤ تووشـی تـاوانو خراپەیـەك هـات سەرزەنشـتی دەکـاتو بـانگی لێ دەکـات بـۆ سـڕینەوەی ئـەو خراپەیە بە ئەنجامدانی کاری چاك.

## ٤- توانای بیرکردنەوەی عەقڵ:

خودای گەورە شتێکی زۆر گرنگی بە مرۆڤ بەخشیوە کە پێی دەوترێت عەقڵ، کە شتە دروستو نادروستو جوان و ناشیرینەکان بە مرۆڤ دەناسێنێتو لێکیان جیادەکاتەوە، پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) خودای گەورە لێی رازی بێت، دەربارەی عەقڵ دەڵێت:(**پەیامهێنەری هەقو دۆستی مرۆڤ و رێنیشاندەرو رزگارکەرو نزیك کەرەوەی مرۆڤە لە خوداو باشترین سەروەتو سامانی مرۆڤە**).

ئەگەر مرۆڤ بەجوانی عەقڵی بەکاربێنێتو بیر لە بەرەنجامی کردەوەکانیو بەرژەوەندیەکانیو چاکەی خۆیو خێزانو کۆمەڵگەکەی بکاتەوە، دەتوانێت بە ئاسانی رێگەی راست بدۆزێتەوەو نەکەوێتە ژێر کاریگەری حەزو ئارەزووە خراپەکانیەوە.

هەربۆیە ئەوانەی بەهۆی کردەوە خراپەکانیان لە دواڕۆژدا دەچنە دۆزەخەوەو دەڵێن:(( وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ))(الملك ١٠).

**واتە:** ئەگەر توانای بیستنی پەیامی هەقو وتەی راستمان هەبوایەو عەقڵمان بەکاربهێنابایەو بەجوانی بیرمان لە شتەکان بکردایەتەوە، ئەمڕۆ تووشی سزای دۆزەخ نەدەبووین.

لە پاڵ ئەم هێزە ناوەکیانەی ناودڵودەروونو ناخی مرۆڤ کە رێنوینی مرۆڤ دەکەن بۆ ناسینی خودای گەورە، پەروەردگار پێغەمبەرانی خۆی رەوانە کردووە بۆ ئەوەی یارمەتی مرۆڤەکان بدەنو پەیامی خودایان پێ رابگەیەنو رێگەی رزگاریو بەختەوەریان نیشان بدەن.

جا ئەگەر مرۆڤ سود لە توانا خودا پێداوەکانی ناو دڵو دەرونیو پەیامی پێغەمبەرانی خودا وەربگرێت، جوانیو شیرینی (باوەڕ)و (کردەوەی چاك) دەچێتە ناو دڵو دەرونیەوەو لە ژیانیدا رەنگدەداتەوەو هەست بەشادیو دڵ ئارامی دەکات .

## وانەی دەیەم:

## بــەرەو كوێ دەچــین ؟

ئێمە زانیمان كە ئێمە لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووین، ماوەیەك لە ژیاندا دەبین و دوای ئــەوە وەك یاســایەكی خــودایی دەمــرین و بــەگوێرەی قورئــان بــۆلای ئــەو دەگەڕێینەوە.

كەواتە دەبێت ئێمە تێگەیشتنی خۆمان بۆ ژیان و مەرگ و دوای مەرگیش فراوان بكەین، مرۆڤەكان بەگشتی دەربارەی (مەرگ) دوو بۆچوونیان هەیە:

### بۆچوونی یەكەم:

هەندێك مرۆڤ پێیان وایە مەرگ كۆتایی ژیانە، هەر مرۆڤێك دوای تێپەڕاندنی تەمەنی دونیای، ژیانی كۆتایی پێ دێت و بەدونیای نەمان دەسپێردرێت، خاوەنانی ئەم بیرو بۆچوونە بەدوو شێوە كاردانەوە بەرامبەر مەرگ دەنوێنن:

ئ - هەندێكیان ناتوانن واز لەبیركردنەوە لە مردن بهێنن و خۆیان لە تیاچوون و نەمانی یەكجارەكی دوای ئەو رزگاربكەن بۆیە هەمیشە بەرامبەر ئەوەی كە بە مردنیان بۆ هەتا هەتا تیادەچن و ژیانیان كۆتایی پێ دێت، دووچاری شڵەژان و بێ تاقەتی دەبن.

ب - بەشێكی دیكەیان دەیانەوێت بەهیچ شێوەیەك بیر لە مردن نەكەنەوەو ئەم مەسەلە لەبیرخۆیان بەرنەوە، تا - بەمەزەندەی خۆیان - بەبێ ئاگابونیان لەمەرگ و فەوتانی دوای ئەو، خۆیان لە هەستی خراپ بپارێزن.

### بەرەنجامەكانی بۆچوونی یەكەم:

لەبەرنجامەكانی بۆچوونی یەكەم گەیشتنی ژیانی مرۆڤە بە چەقێكی بێ ئەنجام و داخستنی پەنجەرەكانی ئومێدە بە روویدا، ئەمەش وا لە هەندێكیان دەكات دووچاری جۆرەها نەخۆشی دەروونی بن و ژیانیان لێ تاڵ بێت.

هەندێكیان بۆ رزگار بوون لەم هەست و بیركردنەوە ناخۆشانە پەنا دەبەنە بەر هەندێك كارو رەفتار بۆ ئەوەی مردن لەبیر خۆیان بەرنەوە، بەڵام ئەوەش چاری دەردیان ناكات، قورئان لەم بارەیەوە دەفەرموێت:(( قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾)) (الكهف ١٠٣-١٠٥).

**واتـه:** بلّـێ ئایـه هـەواڵتان پـێ بـدەم زیـان مەنـدترین‌و دەسـتخەڕۆترین مرۆڤـەکان چ کەسانێکن؟

ئەوانـەن کـه ڕەنـج بەخەسـاربوون‌و هـەوڵ‌و کۆششـیان لـه ژیـانی دونیـادا ون کـردو تیاچوون له کاتێکدا بەخەیاڵی پوچی خۆیان وایان زانیوه باشترین کاریان کردووه.

ئەوانـەی کـه باوەڕیـان بەنیشـانەکانی پـەروەدگاریان‌و گەڕانـەوه بـۆلای ئـەو نـەبوو. بەهۆی ئەوەو کردەوەکانیان تیاچوون‌و له ڕۆژی دوایشدا هیچ سەنگ‌و قورساییەکیان بۆ دانانێم‌و حیسابیان بۆ ناکەم.

## لێکۆڵینەوە:

١- کام مەیلی دەروونییه که ئەم دوو دەسته وا لێ دەکات بەرامبەر به مەرگ گوێی پێ نەدەن یاخود ترس له مردن بێ تاقەت‌و پەرێشانیان بکات ؟

٢- ئایه کەسانێك که گوێ به مردن نادەن ڕێگەیەکی دروستیان بۆخۆیان هەڵبژاردووه؟ ئەگەر وایه بۆ؟

٣- ئەم بیرکردنەوەو تێڕوانینه چ کاریگەریەك بەسەر ژیانی مرۆڤەوه بەجێ دەهێڵێت؟

ئێستا بابچینه لای قورئانی پیرۆزو بزانین دەربارەی بۆچوونی یەکەم چیمان پێ دەڵێت؟ قورئان لەم بارەیەوه دەفەرموێت:(( وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۝٦ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ۝٧ )) (الروم ٦-٧).

**واته:** تەنها شته ڕواڵەتی‌و ڕوکەشەکانی ژیانی دونیا دەزانن‌و له دواڕۆژ بێ ئاگان، ئایـه ئـەوان بیریـان لـه خۆیـان نەکردۆتـەوه بـۆ ئـەوەی لـەوه تێبگـەن کـه خـودای گـەورە ئاسمانـەکان‌و زەوی‌و ئـەوەی لەنێوانیانداـیه بـەبێ ئامـانج دروسـت نـەکردووەو بـۆ کاتێکی دیاریکراویش بەدیهێناون؟

## وانەی یازدەم:

### بۆچوونی دووەم:

بە بۆچوونی ئەمان کە شوێنکەوتووانی ئاینە ئاسمانییەکانن مەرگو مردن بەکۆتایی ژیان نازانن، بەڵکو مردن لە لای ئەوان وەك ئاوابوونی خۆر وایە کە سبەینێ درەوشاوەتر هەڵدێتەوە، مردن لە روانگەی مرۆڤی باوەڕدارەوە سەرەتای لە دایکبونێکی نوێیە، لەبەرەنجامدا مرۆڤ بەهۆی مردنەوە بۆ هەتاهەتایە تیاناچێت، بەڵکو لەجیهانێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ جیهانێکی باڵاتر. باوەڕداران مردن بە قۆناغێکی راگوزەری دەزانن بەرەو نەمریو ژیانی بێ کۆتایی ئەو دونیا. لەبەر ئەوە بەبیرکردنەوە لە مردن هەراسانو بێ تاقەت نابن.

کەواتە مرۆڤ بۆیە بەدیهاتووە بۆ ئەوەی بمێنێتەوە نەك بۆ تیاچوونو فەوتان، مردن تەنها جیهانێکەو دەمانبات بەرەو جیهانێکی دیکە.

بیرکردنەوە لە مردن لای باوەڕدار، بۆ ترسانو نیگەرانی نیە، بەڵکو بۆزیاتر ئەنجامدانی کاری چاکەو بەدەستهێنانی چارەنووسو ئاکامێکی باشە لەدونیای دیکەدا.

بەم جۆرە باوەڕبەخوداو ئاینە ئاسمانیەکانو بەتایبەتیش ئیسلام یارمەتی ئەوەمان دەدەن لە حەقیقەتی مردن تێ بگەینو بیکەینە هاندەرێکی گەورە بۆ ژیانێکی باشتر لەم دونیاو لەو دنیادا.

### بەرەنجامەکانی بۆچوونی دووەم:

١- یەکەمین بەرەنجامی ئەم بۆچوونە کردنەوەی پەنجەرەی ئومێدو دورخستنەوەی ترسو رەشبینییە لە مرۆڤ.

٢- مرۆڤ هاندەدات بۆ سەرکارو کردەوەو چالاکیو باشتر کردنی ژیانی خۆیو کۆمەڵگە، مرۆڤ لەو جۆرە ووزەو تواناو هیمەتێکی زۆری هەیەو لە ئەنجامدانی کارەکانی هەست بە ماندوێتی ناکاتو چێژی لێ دەبات بەهەرچی لە توانایدا بێت خزمەتی مرۆڤەکانی دیکە دەکاتو یارمەتیان دەداتو هەوڵی خۆشکردنی ژیانیان دەدات، چونکە دەزانێت بەوە دوارۆژی ئەو پڕشنگدارترو رازاوەتر دەبێت. هەوڵی ئەم مرۆڤە تەنها بۆ خۆی نیە بەڵکو بۆ خوشگوزەرانی هەموو کۆمەڵگەیە.

٣- شوێنەوارێکی دیکەی تێڕوانینی باوەڕدارانە بۆ مردن نەترسان لە مردن‌و ئامادەیی هەوڵدانە لە پێناو خوادا، خواپەرستانی راستەقینە لە دونیادا دەژین‌و بەجوانی‌و بەخۆشیش دەژین. بەڵام دونیا پەرست نین‌و مردن بە بەڵایەکی گەورە نازانن، چونکە مردن تەنها بۆ کەسانێك بەڵایە کە بە کۆڵێك تاوانەوە دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگار. هەڵبەتە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە خودا پەرستان حەزیان لە مردن بێت، چونکە خودای گەورە بەخۆی مرۆڤی بەوجۆرە دروست نەکردووە، خواپەرست راناکات لە ژیان، چونکە دەزانێت خودای گەورە مرۆڤی بەدیهێناوە بۆ ئەوەی ئەم سەرزەویە ئاوەدان بکاتەوە، ئەو لە خودا دەپاڕێتەوە تەمەنێکی درێژو پڕ تەندروستی‌و کاری چاکەی پێ ببەخشێت . بۆ ئەوەی تا دواهەناسەی لە پێناو خێرو خۆشی خۆی‌و کەسانی دیکەدا بژی‌و خزمەت بکات‌و بەوەش بەسەری بەرزەوە بگەڕێتەوە بۆلای خودای گەورە.

هەر بۆیە لە ئیسلامدا جگە لە ژن بۆ مردنی پیاوەکەی پرسە نابێت لە (٣) ڕۆژ زیاتر بخایەنێت، دەبێت ئەو کەسانەی یەکێکیان لێ مردووە دەست بە ژیانی ئاسایی خۆیان بکەنەوە، چونکە ئیسلام ئاینی مەرگ دۆستی نیە، بەڵکو ئاینی ژیان دۆستی‌و جوانکردنی ژیانە.

مرۆڤی باوەڕدارە کە زۆر لە مردن نەترسا ئەو کاتە دەتوانێت لە دەرخستنی راستیەکان‌و لەرووبەڕووبوونەوەی ستەمکاران‌و زۆرداران ئازاتر بێت. بە تێکۆشان بۆ چەسپاندنی دادپەروەری‌و ئازادی لەنێوان مرۆڤەکاندا لە پێناو خودای گەورەدا تێبکۆشێت.

## وانەی دوازدەم:

# جیهانی ئەمڕۆو بێ ئاگابوون لە ڕۆژی دوایی

لە دونیای ئەمڕۆدا زۆربەی مرۆڤەكان باوەڕیان بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە. بۆ نموونە لەولاتێكی وەكو ئەمریكادا ڕێژەی باوەڕداران لەسەرو (٩٠٪)ەوەیە. مەسیحیەتو ئاینی جولەكەو ئیسلامو سەرجەم ئاینە ئاسمانیەكان لەسەر بناغەی باوەڕبوون بەخوداو بەڕۆژی دوایی داڕێژراوان.

بەلام ئایە شوێنەواری بڕوا هەبوون بە ڕۆژی دوایی لە ژیانی مرۆڤەكاندا ڕەنگی داوەتەوە؟

ئایە مرۆڤەكان لە خۆیان پرسیوە كە ئەگەر ڕۆژێك هەبێتو ئێمە تیایدا زیندو دەبینەوەو خودای گەورە لەسەر ژیانی ئەم دونیایە لێمان بپرسێتەوە، دەبێت ئێمە چۆن بژینو ئەم باوەڕە چ شتێك لە ژیانی ئێمەدا بگۆڕێت؟

لە ڕاستیدا گەرچی زۆرێك لە مرۆڤەكان نكۆڵی لە بوونی دواڕۆژ ناكەنو باوەڕیان پێیەتی، بەلام لەوبێ ئاگان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كەلای هەندێك كەس باوەڕ بەدوا ڕۆژ لە دڵەوە هەڵناقوڵێت، بۆیە شوێنەواری بەسەر ژیانیانەوە زۆردیار نیە.

زانایانی ئەمڕۆ ئەم پرسیارە دەكەن كە بۆچی سەرەڕای ئەو هەموو پێشكەوتنەی مرۆڤ لە ڕووی زانستیو تەكنەلۆژیەوە بەخۆیەوە بینیوە، كەچی جۆرێك لە نا هاوسەنگیو نیگەرانی بەژیانی زۆربەی مرۆڤەكانەوە دیارە؟

بۆچی لەم جیهانەدا سەرەڕای ئەو هەموو خێروبێرە، ملیۆنەها برسیو بێ لانە هەنو بەشێكی كەم لە دانیشتوانی سەرزەووی زۆربەی خێرو بێركەی بۆ خۆیان بەكار دەبەن؟

بۆچی ئەم هەمو شەڕو بازرگانی چەكو بازرگانی كردن بە مرۆڤو ماددە هۆشبەرەكانو چە ندین دیاردەی دزێوی دیكە هەن؟

بۆ دەبێت ژیانی مرۆڤ لە چاخی زانستو پێشكەوتندا دەستەویەخەی ئەم گیروگرفتانە بێت؟ ئایە یەكێك لە هۆكارەكانی ئەم حاڵەتە بێ ئاگایی مرۆڤو لاوازیی باوەڕی ئەو بەڕۆژی دوایی نیە؟

قورئان وێنەی ژیانی کەسانێکمان بۆ دەکێشێت  کە چاویان نەبڕیوەتە ژیانێکی بالاتر لە دواڕۆژداو دەفەرموێت:((الَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَاء يَوْمِهِمْ هَذَا وَمَا كَانُواْ بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ))(الاعراف ٥١).

**واتە:** ئەوانەی کە ئاینی خۆیان کرد بە گاڵتەجاڕیو سەرگەرمی، وەژیانی دونیا فریوی دان، ئەمڕۆ (واتە ڕۆژی دوایی )ئەوان لە بیرخۆمان دەبەینەوە، وەك چۆن ئەوان دیداری ئەم ڕۆژەیان لەبیر خۆیان بردەوە وە نکۆڵیان لە ئایەتو بەڵگەو نیشانەکانی ئێمە دەکرد.

## رامانو لێکۆڵینەوە:

١- بۆچی کەسانێك سەرەڕای ئەوەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیەو لە رووی فیکرییەوە ئەویان قەبوڵە، هەوڵێکی وا بۆ ئەو دونیایە نادەنو بەجۆرێك ڕەفتار دەکەنو دەژین وەك ئەوەی دونیایەکی لەو جۆرەیان لە پێش نەبێت؟

٢- ئایە بێ ئاگابوون لە دواڕۆژ یەکسانە بە پشتگوێ خستنی ژیانی دونیاو دواکەوتوویی؟

٣- بەخوێندنەوەو سەرنجدان لە ئایەتەکانی (٣٢ -٣٧)ی سورەتی (**المؤمنون**)ئەوە روونبکەرەوە ئەم ئایەتانە کام بۆچوونمان دەربارەی مەرگ بۆ لێکدەدەنەوەو روون دەکەنەوە:(( فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِنْهُمْ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴿٣٢﴾ وَقَالَ الْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِلِقَاء الْآخِرَةِ وَأَتْرَفْنَاهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا مَا هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ﴿٣٣﴾)) (المؤمنون ٣٢-٣٣).

## پێشنیار:

١- بگەڕێرەوە بۆ یەکێك لەسەرکردەو خواناسە گەورەکانو بزانە ئەوان چۆن بیریان لە ژیانو مردن کردۆتەوە.

٢- بگەڕێرەوە بۆ وەسیەتنامەی سەرکردەی شەهید(قازی محمد)و بزانە وەك باوەڕدارێكو تیکۆشەرێك لە پێناو مافی میللەتەکەی چۆن بیری لە مردنو شەهید بوون کردۆتەوە.

## وانەی سێزدەم:

# بەڵگەکانی بوونی رۆژی دوایی (الآخرة)

زۆرن ئەو بەڵگانەی ژیانێکی بالآتر لە جیهانێکی دیکەدا دەسەلمێنن کە پێی دەوترێت(رۆژی دوایی).

**- سەرەتا با لە قورئانەوە دەست پێ بکەین و بزانین خودای گەورە بە چ شێوازێك ئەم پرسەمان بۆ دەخاتە روو؟**

خودای گەورە دەفەرموێت:(( اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ رَيْبَ فِيهِ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا))(النساء ٨٧).

**واتە:** خودای گەورە تاكو تەنهایەو جگە لە ئەو هیچ خوداو پەرستراوێکی دیکە نیە، بەدڵنیاییەوە لە رۆژی دوایدا کۆتان دەکاتەوە، چ کەسێك لە خودای گەورە راستگۆترە؟!

هەروەها دەفەرموێت:(( أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾))(المؤمنون ١١٥-١١٦).

واتە: ئایە ئێوە وا دەزانن ئێمە ئێوەمان هەروەها بێ هودەو لە خۆڕاییو بێ ئامانج بەدیهێناوەو بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوە؟ بەرزیو بالآیی بۆ خودای دەسەڵاتداری راستەقینە، جگە لە ئەو هیچ خودایەکی دیکە نیەو پەروەردگاری عەرشی بەڕێزە.

خودای گەورە دەفەرموێت:(( وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾))(ص ٢٧-٢٨).

واتە: ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی وا لەنێوان ئەواندایە بە بێ هودە بەدیمان نەهێناون، بۆچوونی وا گومانی بێ باوەڕانە، جا وەی بە حاڵی بێ بڕوایان لەو کاتەدا کە دەخرێنە ئاگرەوە. ئایە بڕیاردەدەن ئەوانەی کە باوەڕیان هێناو کارو کردەوەی چاك دەکەن، وەك ئەوانە وابن کە خەریکی خراپە نانەوەن لە زەویدا؟ یاخود خۆپارێزان وەك تاوانبارا لێبکەین!

ئەم چەند ئایەتەی سەرەوە ئامانجدار بوونی ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویەداو بوونی حیکمەت لە بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەویو مرۆڤدا دەکات بەبەڵگەی رۆژی دوایی. بەواتایەکی دیکە بڕوا نەبوون بە رۆژی دوایی یەکسانە بەوەی بوترێت هەرچی حیکمەتو ئامانج هەیە لەم بونەوەرو ژیانەدا نیەو هەر هەمووی بیٚ هودەو پڕو پوچەو ریکەوت بەڕێوەی دەبات کە هەرگیز مرۆڤێك جوان بیربکاتەوە شتی لەو جۆرە ناڵێت.

## عەقلی مرۆڤ و بەڵێنی پێغەمبەران:

عەقڵ بە مرۆڤ دەڵێت ئەگەر ئەگەری مەترسیەك لە ئارادا بوو خۆلادان لێی پێویستە، گەر وایەرێکی کارەبا بەسەر دیواری ماڵەکەمانەوە بێتو کەسێك پێمان بڵێت دەستی لێنەدەی کارەبای تێدایە، دەستی بۆنابەین. گەرچی ئەگەری ئەوەش هەیە کە قسەی ئەو کەسە راست نەبێت و کارەبای تێدانەبێت، ژیانی دوارۆژیش کە بەختەوەری یاخود بەد بەختی هەتاهەتاییە عەقڵ داوای ئەوەمان لیٚ دەکات بەجدییەوە وەریبگرین، ئەمە لە حاڵێکدایە کە سەرجەم پێغەمبەرانی خودا مرۆڤەکانیان بۆ باوەڕهێنان بەژیانی دوارۆژ بانگەشەکردووە، چونکە باوەڕ بە رۆژی دوایی بەشێکە لە باوەڕبوون بەخودای گەورەو تەواوکەری ئەوە، قورئانیش ئەوەندە بە بڕشتانەو راشکاوی باسی رۆژی دوایمان بۆ دەکات، کە جێگەی هیچ گومانو دوو دڵیەك ناهێڵێتەوە، قورئان دوای باوەڕهێنان بەخودای گەورە گەورەترین بایەخی بە رۆژی دوایی داوە.

## بیرکردنەوە:

کاتێك دەبینین پێغەمبەران کە راستگۆترین مرۆڤەکان بوونو هەواڵی جیهانی دوارۆژیان داوە، پێویستە لە رووی عەقڵیەوە چ بڕیارێکی شایستە بدەینو چۆن رەفتار بکەین؟

## دوارِۆژ لە دوتویٚ دادپەروەری خوداییدا:

دادپـەروەری یـەکێك لـە سیفاتە خوداییەکانـە، خـودای گـەورە دادپـەروەرەو جیهانی لەسەر بناغەی دادپەروەری دروست کردووە.

لـەم روانگـەوە خـودای گـەورە بـەڵێنی داوە کـە هـەموو کـەس بگەیـەنێت بـەوەی شایستەیەتی و مـافی کـەس تێدانـەبات و بـە دادپەروەرانـە بجوڵێتـەوە، ژیـانی دونیـاش بەسروشتی خۆی شوێنی بەدیهێنانی ئەم وادە خوداییە نیە، چونکە:

ئـ – تەمـەنی مـرۆڤ کـورت و سـنوردارە، زۆرێـك لـە مرۆڤـەکان پـێش ئـەوەی بـەرەنجامی کارەکانی خۆیان بە تەواوی ببینن، کۆچی دوایی دەکەن.

ب – پاداشتی زۆر کردەوە وەك پاداشتی شەهید بەهۆی نەمانی لەدونیادا نادرێتەوە.

پ – پاداشتی مرۆڤێك کە خزمـەتی بە خـەڵکانێکی زۆر کـردووە، لەبەر کـورتی ژیـانی مرۆڤ مەیسەر نابێت.

ت – سزادانی کەسانێك کە ستەمیان لە کەسانی دیکە کردووە، بۆنموونە کەسانێکیان کوشتووە، لەم دونیایەدا پیادە ناکرێت.

ج – بـــەهۆی ســـتەمی کەســـانی دیکـــەوە هەنـــدێك کـــەس دەرفـــەتی گەشـــانەوەو پێشکەوتنیان لە دەست دەچێت و دووچاری جۆرەها ناخۆشـی دێن، کـە لـەم دونیایـەدا حیساب بۆ هەموو ئەوشتانە ناکرێت، لەبەر ئەوە:

ئـ- دونیـا بەجۆرێکـە کـە مرۆڤـەکان نـاتوانن بـەرەنجام و بەرهـەم و کردەوەکـانی خۆیـان بەتەواوەتی دەستکەوێتەوە.

ب- ئـەو سـتەمانەی کـە هەنـدێك لـە هەنـدێکی دیکـە دەیکـەن بەشـێوەیەکی تـەواو لـەم جیهانەدا قەرەبوو ناکرێنەوە.

## بەڵگە هێنانەوە:

لەبـەر رۆشـنایی ئـەوەی باسـکرا بـە بەڵگـەوە بیخـەرە روو کـە بۆچـی لەسـەر بناغـەی دادپەروەری خودایی بوونی جیهانێکی دیکە پێویستە؟

## وانەی چواردەم:

# مـەنزڵگەی دوایی

ئایە مرۆڤەکان دوای مردن دەچنە جیهانی دواییەوە یاخود پێش دەستپێکردنی ژیانی ئەو دونیا قۆناغێکی دیکەیان لە پێشەو دەبێت پیایدا بڕۆن؟ ئایە قۆناغی دوای مردن قۆناغی بێ ئاگاییە؟ باپێش هەموو شتێك لە روانگەی چەند ئایەتێکی قورئانیەوە سەیری ئەم پرسە بکەین‌و بزانین مەنزڵگەی دوایی مرۆڤ کوێیەو چی بەسەردێت‌و هەڵوێستی مرۆڤەکان کە لە چۆنیەتی ژیانی ئەم دونیایەیانەوە سەرچاوەی گرتووە چیە:

١ – خودا دەفەرموێت:(( حَتَّى إِذَا جَاء أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ۝٩٩لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ۝١٠٠)) (المؤمنون ٩٩ – ١٠٠).

**واتـە:** کاتێـك مـردن بەیـەکێك لەوانـە بگـات (ئەوانـەی چـاکەکارنەبوون)دەڵێـت: پەروەردگارم بمگێڕەرەوە بۆ دونیا بەڵکو کردەوەی چاك بکەم لەوەی لەوێ بەجێم هێشتووە. نەخێر ئەوە تەنها قسەیە کە ئەو دەیکات، دەنا تازە پەردەیەك لەنێوان ئەوو ژیانی دونیادا دروست بووە تا رۆژی هەڵسانەوەو زیندووبوونەوە.

٢- خودا دەفەرموێت:(( إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا۝٩٧ إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلاً ۝٩٨))(النساء ٩٧– ٩٨).

**واتە:** ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان دەکێشن لە کاتێکدا بەرامبەر بەخۆیان ستەمیان کردووە پێیان دەڵێن: ئێوە لە کوێ بوون؟

دەڵێن: ئێمە لە زەویدا رەش‌و روت‌و بێ دەسەڵات بووین.

پێیان دەڵێن: ئایە زەوی خودا فراوان نەبوو تاکو بەو حاڵە رازی نەبن‌و کۆچی تێدا بکەن؟

ئەوانە مەنزڵگەیان دۆزەخە کە چارەنووسێکی یەکجار خراپە.

٣- خودا دەفەرموێت:(( الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُواْ الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ))( النحل ٣٢).

**واتە:** چاکەکاران کاتێك فریشتەکانی خودا گیانیان دەکێشن دەڵێن سڵاوی خواتان لێ بێت، بڕۆنە بەهەشتەوە لەبەرامبەر ئەو کردەوانەی کردوتانە.

٤- خودا دەفەرموێت:(( فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ﴿٤٥﴾ النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴿٤٦﴾)) (غافر ٤٥ – ٤٦).

**واتە:** خراپترین سزا دەوری داروەستەکەی فیرعەونی دا. ئەوانەی هەموو بەیانیو ئێوارەیەك دەخرێنە روو و ئاگریان نیشان دەدرێت، کاتێکیش رۆژی دوایی بەرپابوو (فەرمان دەکات) کە داروەستەی فیرعەون بخەنە خراپترین سزاو ئەشکەنجەوە.

## پەیامی ئایەتەکان:

١- مرۆڤەکان لەکاتی مردندا ئەو هۆشیاریو توانایەیان هەیە کە بتوانن گفتوگۆ لەگەڵ خودای گەورەو فریشتەکان بکەنو وەڵامی ئەوان بدەنەوە .

٢- مرۆڤ دوای مردن دەچێتە دونیایەکەوە کە پێی دەوترێت (بەرزەخ) تا بەرپابوونی قیامەت لەو جیهانەدا دەمێنێتەوە کە قۆناغێکە لەنێوان مردنو رۆژی دوایی.

٣- مرۆڤ دوای مردن لە دۆخێکدا دەبێت کە پەی بە فریشتەکان ببـاو گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات.

٤- چالاکی جەستەی مرۆڤ لە بەرنجامی پەیوەندی ئەوەوەیە بەگیانو دەرون ،لەم رووەوە کاتێك گیانی مرۆڤ لەلایەن فریشتەکانەوە وەردەگیرێتەوە، جەستە چالاکیو ئەو ووزەیەی هەیەتی لە دەستی دەدات، بەڵام گیان چالاکی هۆشیارانەی خۆی هەر بەردەوام دەبێت.

٥- قۆناغی یەکەمی پاداشت دانەوەی باوەڕدارانو سزادانی بێ باوەڕان هەر لە بەرزەخەوە دەست پێدەکات.

٦- جیهانی بەرزەخ ئەو سنوردارییەی ئەم جیهانەی نیەو مرۆڤ دەتوانێت پەی بەهەندێك شت بەرێت کە لەوەو پێش ئەو توانایەی نەبووە.

**یەکەم–** چ لێکچونێك لـە نێـوان دونیـاو بـەرزەخ لەلایەکـەوەو بـەرزەخ و ڕۆژی دوایـی لەلایەکی دیکەوە هەیەو لە ئارادایە:

١–

٢–

٣–

٤–

**دووەم –** چ شتێك لە دونیاوە لەگەڵ مرۆڤ دەڕوات بۆ بەرزەخ و لە ئەو جیا نابێتەوە؟

١–

٢–

٣–

٤–

## وانەی پازدەم:

# کارنامەی مـرۆڤ لە بەرزەخدا

مرۆڤ لە دونیادا کۆچی دوایی دەکاتو دەڕوات، بەڵام ئاسەواری کارو کردەوەکانی ئەو هەردەمێنێتو نافەوتێتو کاردەکاتە سەر ژیانی مرۆڤەکانی دوای خۆی.

پێغەمبـەر (د.خ) لـە فەرموودەیەکـدا لـەم رووەوە ئامـاژە بـەوە دەکـات:((مـن سـنّ في الاسلامِ سُنّة حسنة فلهُ اجرها واجرُ من عملَ بها الى يومِ القيامةِ ومن سنَّ سُنّة سئيةً فعليهِ وزرها ووزر من عمل بها الى يومِ القيامةِ)).

واتە: هەر کەس رێبازو نەریتێکی چاك نیشانی خەڵکی بداتو لەناو کۆمەڵگەدا بڵاوی بکاتەوە، تا ئەو رۆژەی کار بەو رێبازە چاکە بکەن ئەویش لـەو چاکەکردنەدا بەشدارە، بـە پێچەوانەشـەوە ئەگـەر مـرۆڤ رێو رەسمێکـی خـراپ دابهێنێـتو خـەڵکی چـاوی لێبکـەنو بـەهۆی ئـەوەوە دوچـاری تـاوانو خراپـە بێن، تـا ئـەو رۆژەی لـەناو خەڵکیـدا کاریگەری بمێنێت لەو تاوانانەدا بەشدارە.

ئەمـەش وا لـە بـاوەڕدار دەکـات لـە بیرکردنـەوەو قسـەو رەفتاریـدا هۆشـیار بێـتو لـە خـەمی ئـەوەدا بێـت هەمیشـە پێشـەنگو سەرمەشـقو رەمـزی چـاکە خـوازیو مـرۆڤ دۆستی بێتو خۆی رەفتار بەرز بێتو هەوڵبدات خەڵکیش بەهەمان شێوە بن.

قورئـانی پـیرۆز لـە چـەندین ئایەتـدا مـرۆڤ هۆشـیار دەکاتـەوە کـە تـەنها بەرامبـەر ئەوکردەوانـە لێپرسـراو نیـە کـە خـۆی راسـتەوخۆ ئـەنجامیان دەدات بـەڵکو بەرامبـەر هەموو ئەو ئاسەوارانەش بەرپرسیارە لە دوای خۆی بـەجێیان دەهێڵێت، ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنێت مرۆڤی باوەڕدار دەبێت لەبیری ئەوەدابێت کە دوای مردنیشی هەر پڕشنگی جوانیو پاکیو چاکەکاری بداتـەوەو خـەڵکان بـەخێر یـادی بکـەنو ئـەو شـوێن پـەنجەو مۆرکەی بە ژیانەوە بەجێی هێشتووە مایەی سەربەرزی هەردوو دونیا بێت.

خودای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت:(( إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ)) (يس ١٢).

**واتـە:** ئێمـە مردووەکـان زینـدوو دەکەینـەوە، وە ئـەو کـارو کردەوانـەی پـێش خۆیـان خسـتووەو ئـەو شـوێنەوارەش لـە دوای خۆیـان بـەجێی دەهـێڵن دەینوسـینو تۆمـاری دەکەینو هەمووشتێکمان لە تۆمارێکی روونو ئاشکرادا تۆمارو هەژمارکردووە.

**هەروەها دەفەرموویێت:** (( يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ))(القيامة ١٣).

**واتە:** لەو ڕۆژەدا (واتە ڕۆژی دوایی) مرۆڤ هەواڵی پێ دەدرێت دەربارەی ئەوەی پێشی خستووەو ئەوەی دوای خۆی بەجێی هێشتووە.

## گفتوگۆ:

کام دەستە لەکاروکردەوە بەو کارو کردەوە دادەنرێت کە مرۆڤ پێش خۆی دەینێرێتو کامەشیان بە ئاسەوارو شوێنەواری ئەو دادەنرێت ؟

## پێشنیار:

باسی هەندێك لەو چاکەکارانەی شارەکەت یاخود گوندەکەت بکە کە شوێنەواری خێرو چاکەیان لەدوای خۆیان بەجێ هێشتووەو خەڵکی هەمیشە بەچاکە ناویان دەبەن؟

## وانەی شازدەم:

# سەرنجامی ئاکامی کار

له وانه‌ی رابردوو باسی ئه‌وه‌مان کرد که له رۆژی دواییدا چ رووداوگه‌لێك رووده‌ده‌ن‌و دادگای خودایی چۆن داده‌مه‌زرێت؟ گه‌واهیده‌ره‌کان گه‌واهی ده‌ده‌ن‌و نامه‌ی کرده‌وه‌کان به مرۆڤ ده‌درێته‌وه.

له‌م وانه‌یه‌دا به سوود وه‌رگرتن له قورئانی پیرۆز هه‌وڵده‌ده‌ین سه‌ره‌نجام‌و چاره‌نووسی مرۆڤ تا کۆتایی مه‌نزڵ به‌دوایدا بچین‌و تێبگه‌ین که چ په‌یوه‌ندییه‌ك له نێوان کرده‌وه‌کانمان له‌م دونیایه‌داو پاداشتدانه‌وه‌ی رۆژی دوایدا هه‌یه؟

(( وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاء يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٧١﴾ قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ ﴿٧٣﴾ ))(الزمر ٧١-٧٢-٧٣).

**واته:** ئه‌وانه‌ی بێ باوه‌ڕبوون پۆل پۆل به‌ره‌و دۆزه‌خ پێش خۆدران‌و ره‌تێنران، کاتێك پێی گه‌یشتن ده‌رگاکانی کرانه‌وه. ده‌رگاوانانی دۆزه‌خ پێیان وتن: ئایه خودای گه‌وره پێغه‌مبه‌ری له خۆتان بۆ ره‌وانه نه‌کردن؟ بۆئه‌وه‌ی به‌ڵگه‌و ئایه‌ته‌کانی خوداتان به‌سه‌ردا بخوێنێننه‌وه‌و له‌سه‌ره‌نجامی ئه‌م رۆژه هۆشیارتان بکاته‌وه؟ وتیان به‌ڵێ، به‌ڵام فه‌رمانی سزادان به‌سه‌ر بێ باوه‌ڕان سه‌پاوه. پێیان ده‌وترێت بڕۆنه ناو دۆزه‌خه‌وه‌و بۆ هه‌تاهه‌تایی تێدا بمێننه‌وه دۆزه‌خیش خراپترین شوێنی حه‌وانه‌وه‌ی خۆ به‌زل زان‌و ملهوڕه‌کانه، به‌ڵام ئه‌وانه‌ی له خودا ترساون‌و گوێڕایه‌ڵی فه‌رمانه‌کانی ئه‌و بوون‌و چاکه‌کاربوون پێیان ده‌وترێت پۆل پۆل بڕوادارانی خۆپارێز به‌ره‌و به‌هه‌شت بران، تاکاتێك پێی گه‌یشتن ده‌رگاکانی خرانه سه‌ر پشت‌و ده‌رگه‌وانانی به‌هه‌شت پێیان وتن: سلاوتان لێ بێت. باش ژیان‌و پاك بوونه‌وه، به نه‌مری بڕۆنه ناویه‌وه، جا وتیان: سوپاس بۆ ئه‌و خودایه‌ی که ئه‌و به‌ڵێنه‌ی پێی داوین بردیه سه‌ر، وه کردینی به میراتگری زه‌وی‌و له به‌هه‌شت له هه‌رشوێنێك دڵمان ده‌یخوازێت جێگه بگرین، چ خۆشه

پاداشتی ئەوانەی کاریان کرد بۆ هەتا هەتایی تیایدا بمێننەوە، دۆزەخیش خراپترین شوێنگەو شوێنی حەوانەوەی خۆ بەزل زان و ملهوڕەکانە.

خودا دەفەرموێت:(( وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ))(الانبياء ٤٧).

**واتە:** ئێمە تەرازوی دادپەروەری لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین هیچ کەسێکیش بچوکترین ستەمی لێ ناکرێت، بە ئەندازەی دنکە خەردەلێکیش بێت، واتە زۆر بچوکیش بێت، دەیهێنین و تەنها ئێمە بەسین بۆ لێپرسینەوە.

ئەوەی کردەوەکانی مرۆڤیش لە ڕۆژی دواییدا دەکێشێت خودای گەورە خۆیەتی، کە کێشەرێکی وردو دادپەروەرو لە هەمانکاتدا میهرەبان و بەخشندەیە. لە دادگای خودادا هەرکەس بە تەنها و لەگەڵ کردەوەکانی خۆیدا ئامادە دەبێت.

## ١ - شوێنی خراپەکاران:

دوای کۆتایی هێنانی دادگا، دۆزەخیەکان دەستە دەستە بەرەو دۆزەخ پەلکیش دەکرێن، لەوێ پەشیمان دەبنەوەو حەسرەت هەڵدەکێشن بۆچی ژیانی دونیایان بەو جۆرە بەسەر برد دووچاری ئەم ڕۆژو چارەنووسەیان بکات، داوا لە خودای گەورە دەکەن کەبیانگێرێتەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی بەجۆرێکی دیکە بژین و بەهەشت مسۆگەر بکەن، بەڵام تازە دەرفەتی ژیانی دونیایان لەدەست چووە، داوا دەکەن سزایان لەسەر سوك بکرێت بەڵام بێ هودەیە.

باوەڕدار کە ئەم چارەنووسەی لەبەر چاوە هۆشیار دەبێتەوە. لاوان دەبێت هەوڵبدەن لاوێتی خۆیان لە هەندێك کاری وەهادا بەسەر نەبەن سودی ئەم دونیاو ئەو دونیای تێدا نەبێت، دەبێت خۆیان لە خواردنەوەی مەی و ماددە بێهۆشکەرەکان و قومارو داوێن پیسی و درۆو دووڕوویی و فێڵکردن و ئازاردانی کەس و کارو خراپە کردن لەگەڵ هاوڕێ و دۆست و سەرجەم مرۆڤەکان بەدوور بگرن، نابێت ڕێگە بدەن کەس بیر لەوە بکاتەوە بۆ خراپەکاری و تۆقاندنی خەڵك و ئامانجی خراپ بەکاریان بێنێت. چونکە خودای گەورە عەقڵی پێ بەخشیوین و لێپرسراوین بەرامبەر خۆمان و خێزانەکانمان و کۆمەڵگەو لەسەر کردەوەکانمان لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت.

## ٢- شوێنی چاکەکاران:

چاکەکاران‌و رزگاربوان بەرەو بەهەشتی خودایی دەبرێن، بەهەشت لە پێشوازیاندا دەبێت‌و بە گەیشتنیان دەرگاکانی بۆیان دەکرێنەوە، بەسڵاو پێشوازیان لێ دەکرێت‌و مژدەیان پێ دەدرێت کەبەرامبەر کردەوە باشەکانی دونیایان بۆ هەتا هەتایە لە نازو نیعمەتی ئەم بەهەشتەدا دەمێننەوەو هەرگیز نامرن‌و لە لوتکەی بەختەوەریدا دەبن، هەرچی دڵیان بیخوازێت بۆیان ئامادە کراوە، هەرچی بڵێیت غەم‌و پەژارەو ناخۆشییە لە بەهەشتدا بوونی نیە.

## دیالۆگ کردن لەگەڵ خوددا:

جار یَکی دیکە بیر لە خۆت بکەرەوە، توانا شاراوەکانی خۆت زیاتر بدۆزەرەوەو بەخێراتر لە رێی ئەنجامدانی کاری چاک‌و باش لە ژیانەوە بەرەو بەهەشت برۆ، نەخشە دانێ بۆ ئەوەی زۆرتر سوود لە تواناکانت وەربگریت‌و ببیتە نموونەی مرۆڤێکی چاکەخوازو ئامانج بەرز.

## بیرکردنەوەو لێکۆڵنەوە:

١-ئامادەکردنی گەواهیدەران لە رۆژی دواییدا بۆ چیە؟

٢- بەهۆی چ شتێکەوە مرۆڤ لە رۆژی دوایدا هیچ ستەمێکی لێ ناکرێت؟

## گفتوگۆ:

چی لەم ئایەتانە تێگەیشتین‌و چ کارێك دەکەنە سەر مرۆڤی باوەڕدار؟

## وانەی حەڤدەم:

### ئـ - دەرکەوتنی ئیسلام و هاتنی پێغەمبەر(د.خ):

چیرۆکی سەرهەڵدانی ئیسلام لە هاتنی پێغەمبەری مەزن(محمد) (د.خ)دەست پێدەکات، لەوکاتەوە کە خودای گەورە قورئانی ناردە سەر دڵە پڕ سۆزو خۆشەویستەکەی، کە بە پرۆگرامی ژیانی موسوڵمانان دادەنرێت ،بۆ ئەوەی ڕێنمایی هەموو مرۆڤایەتی بکات لە هەموو کاتو شوێنێکدا بۆ سەر ئاینی پاکی ئیسلام، وەك خودای گەورە دەفەرموێت:((الَر كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ))(ابراهيم ١).

**واتە:** سوێن بە هەر سێ پیتی (ا.ل.ر)ئەم پەیامەی کە بۆمان ناردووی بۆ رزگارکردنی خەڵکە لە تاریکیەوە بۆ روناکی بە پشتیوانی خودای گەورە، بۆ ئەوەی ڕێنماییان بکات بۆ ڕێگەیەکی بەرزی سوپاسکراو، هەروەها خودای گەورە بڕیاری داوە کە ئەم پەیامە بپارێزێتو هەتا رۆژی قیامەتیش کەس ناتوانێت لەناوی ببات .وەك دەفەرمووێت: (( إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)) (الحجر ٩).

**واتە:** ئێمە ئەم پەیامەمان ناردووەو ئێمە خۆشمان دەیپارێزین.لەدوای قورئانیش فەرموودەکانی پێغەمبەرمان هەیە کە بەهۆیەوە یاساو شەریعەتی ئیسلامی لێ وەردەگیرێت.

ئیسلام سەرەڕای ئەوەی کە ئاینێکە لە هەمان کاتدا شارستانیەتو کولتوورو پەیامێکی چاکسازییە، سەرچاوەیەکیشە بۆ زانستو مەعریفە.

پێغەمبەر (د.خ) نێردراوێکی بەرێزی خودای گەورەو چاکسازێکی جیهانییە، خاوەنی پەیامێکی گەورەی ئاسمانییە، لە سەرەتادا توشی رووبەڕووبوونەوەیەکی سەخت بوو لەگەڵ خەڵکی نەفامو ستەمکاردا، چونکە لەلایەك نەیاندەویست واز لەبت پەرستیو رەوشتەوە خێڵەکیەکانیان بێنن، لەلایەکی دیکەش ستەمکاران زۆر لە دادپەروەری ئیسلام دەترسان، چونکە ئیسلام بانگی مرۆڤی دەکرد بۆ یەکتا پەرستیو پەیوەست کردنی مرۆڤ لە رووی رۆحیو جەستەییەوە بەخوداوە کە پێویستی بە هیچ شتێك نەبوو، بەڵام ئاینەکانی پێشو دەبوایە بەهۆی بتێکەوە یان کەسێکەوە بگەشتایا بە خودا، لەبەر ئەوەی ئیسلام بانگەشەی بۆ ئازادی مرۆڤ دەکردو هەمووی بەیەك چاو

سەیر دەکردو کەسی بەگەورەتر نەدەزانی، لەبەر ئەوە ستەمکارو دەرەبەگو خاوەن بەرژەوەندیە جۆر بەجۆرەکان دژایەتیان دەکرد، هەتا گەیشتە شەڕو کوشتار، هەر بەهۆی بەرگری کردنی پێغەمبەری خوداو پەیامەکەی لەخەڵکی چەوساوەو هەژارو نەدارو کۆیلەکان، ناچاریان کرد کە خۆشەویسترین نیشتیمانی خۆی کە(مەککە) بوو بەجێ بهێڵێتو لە دوای هەشت ڕۆژ بە ڕۆیشتن بە بیابانو کەژو کێوەکاندا لە ١٦ڕەبیعی یەکەم واتە٢٠ /٦٢٢/١١ ز گەیشتە شاری مەدینە، ئەمەش ناو دەبرێت بە (کۆچ) کە ئەمەش ڕوداوێکی گەورەیە لە مێژووی ئیسلامدا، چونکە بە سەرەتای پتەوبوونو ڕەگ داکوتانی ئیسلام دادەنرێتو لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابیشدا ئەم ڕۆژە کرایە سەرەتای ساڵی کۆچی بۆ موسوڵمانان.

## ب - پێناسەی ئیسلام:

ئیسلام واتە ملکەچ بوونە بۆخودای گەورە و پەرستنیەتی بەتاك و تەنها بەجێ هێنانی فەرمانەکانیەتی وبڕیارنەدانی هاوەڵە بۆی و وازهێنانە لەوشتانەی کەڕێگەی لێ گرتووە. ئیسلام ئەو ئاینەیە کەخوای گەورە بۆمرۆڤایەتی ناردووە و وەك دەفەرموێت:(( إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللهِ الإِسْلاَمُ)) (آل عمران ١٩) .

## ئیسلام بەمانا تایبەتیەکەی:

ئاستی تێگەیشتنی گەلان بە درێژایی مێژوو لەگۆڕاندا بووە، لەبەر ئەوەی هەتا مرۆڤایەتی بەرەو سەرەوە هاتبێت ئاستی زانست وزانیاری پێشکەوتوەو لەگەڵیدا مرۆڤیش بەرەو پێش کەوتن هەنگاوی ناوە، لەبەر ئەوە خودای گەورەش بۆهەر زەمان وژینگەیەك پێغەمبەرێکی ناردووە، کاتەکەشی بۆدیاری کردووە، لەبەر ئەوە خودای گەورە زانابووە بەوەی کەئەم سەردەمەی ئێمە سەردەمی زانست وپێشکەوتنو تەکنەلۆژیا دەبێت، لەبەر ئەوە ئاینێکی ناردووە کەلە هەموو ڕووەکانەوە تەواوبێتو موعجیزەی ئەم ئاینەش قورئانو زانستەو یەکەم ئایەتیشی بە ووشەی (اقرأ) واتە بخوێنە دەست پێدەکات.

هەرلەبەرئەوە داوای لەشوێنکەوتوانی ئاینەکانی دیکە کراوە کەبەهاتنی ئەم ئیسلامە نوێیە شوێنی بکەون، چونکە ئەم ئاینە نوێیە لەهەموو ڕوویەکەوە تەواوەو کەم وکورتی تیدا نیە تایبەت نیە بەژینگەیەكو نەتەوەیەك بەڵکو بۆهەموو گەلانی

سەرزەوی بەبێ جیاوازی هاتووە وەك خودای گەورە دەفەرموێت:(( وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ)) (الانبیاء١٠٧).

**واتە:** ئێمە پێغەمبەرمان ناردووە هەتا سۆزو بەزەیی بێت بۆهەموو جیهانیان.

لەبەرئەوە ئەم ئاینە کەموحەمەد پێغەمبەر (د.خ) هێناویەتی بۆهەموو مرۆڤایەتییە بەبێ جیاوازی و تیایدا کەس لەکەس گەورەتر نیەو هیچ نەتەوەو رەنگێك رێزی زیاتری نیە بەسەر ئەوی دیکەدا، تەنها بەکردەوەی چاك وخواپەرستی نەبێت.

### پرسیار:

بۆچی ئاینە ئاسمانیەکانی پێشوش بە ئیسلام ناو براون؟

### گفتوگۆ:

ناوی ئیسلام پەیوەندی بە ئاشتی خوازییەوە چیە؟

## وانەی هەژدەم:

# گرنگترین تایبەتمەندییە گشتیەکانی ئیسلام

### یەکەم - خودایی بوون (الرَّبانیة):

واتە ئاینی ئیسلام سەرەتاو کۆتاییو پێکهاتەی پەیامەکەی هەمووی لەخوداوەیە، و خودایی بوونی شەریعەتی ئیسلامیش لەدوو رووەوەیە:

### ١ - خودایی بوونی سەرچاوەی پەیامەکەی:

واتە ئەم پرۆگرامی ئیسلامە، ئەو ئامانجانەی کە دیاری کردووە پێی بگات لەلایەن خوداوە دیاری کراوە کە بریتییە لەو قورئانەی کە بۆ پێغەمبەر (د خ) نێردرا.

ئەم پەیامە وەك ئەوەی لە خوداوە هاتووە؛ لەگەڵ رەچاوکردنی واقیعی ئەو شوێنو خەڵکەشدا کە یەکەم جار لێی دابەزیوە لە سەر ئاستی بنەماو بەها باشەکانیدا، کاریگەری هیچ خێڵو نەتەوەو چینو توێژو حیزبو گەلێکی بەسەرەوە نیە، بەڵکو بە ویستی خودا خۆی داڕێژراوەو مەبەستیشی رێنماییو رۆشن کردنەوەی ژیانە بۆ مرۆڤ هەروەها هەڵقوڵاوی سۆزو میهرەبانیو جوانیو لێبوردەییە.

خودای گەورە دەفەرموێت:(( يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءكُم بُرْهَانٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا)) (النساء ١٧٤).

**واتە:** ئێوە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکتان بۆ هاتووەو روناکیەکی ئاشکرامان بۆڕەوانە کردوون .

### ٢ - خودایی بوونی ئامانجەکان:

لە دوای بانگەشەکردن بۆ ژیانێکی سەربەرزانە لەم دونیایەدا کۆتا ئامانجی ئیسلام ئەوەیە کە مرۆڤ پەیوەست بێت بە خوداوەو رەزامەندی خودای دەست بکەوێت، هەروەها دەبێت ئامانجی کۆتایی مرۆڤیش هەر ئەوە بێت کە بتوانێت لەژیانی دونیادا رەزامەندی خودا بەدەست بهێنێت وەك دەفەرموێت:(( يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ))(الانشقاق٦).

**واتە:** ئەی ئادەمیزاد تۆ لە هەوڵو رەنجدانی بەرەو پەروەردگارتو پێشی دەگەیت.

## دووەم - ئینسانی بوون:

مەبەست لە ئینسانی بوون، واتە مرۆڤ لەم ئاینەدا ڕێزو پایەیەكی گرنگی هەیە، ئامانجی گەورەی ئیسلام بۆ ئەوەیە مرۆڤ بەختەوەر بكاتو مافەكانی بۆ بگێڕێتەوە.

پێغەمبەری خودا مرۆڤێك بوە وەك ئێمە، خودای گەورە قورئانی بۆ ناردووەو بە پاكی گەیاندوویەتی بە ئێمە، لە پەیامی هەموو پێغەمبەراندا مرۆڤ ئامانجی سەرەكیە، سەرەتا بانگی دەكات بۆ پەرستنی خودا بە تەنیاییو پاشان كاریان كردووە بۆ چەسپاندنی دادپەروەری لە نێوان مرۆڤەكانو بانگەشەكردنیان بۆ برایەتیو دوركەوتنەوە لە زوڵمو زۆر لە یەكدی بۆ ئەوەی بە ئاسودەیی بژین.

## گرنگترین بنەماكانی ڕێزگرتنی مرۆڤ لەئیسلامدا:

### ١ - جێنشینی لەسەر زەویدا:

خودای گەورە ڕێزی لەمرۆڤ گرت كاتێك كە كردیە جێنشین وئاوەدان كردنەوەی زەوی پێ سپارد بۆ ئەم مەبەستەش عەقڵو زانیاری پێ بەخشیو لەسەرو فریشتەكانەوە ڕێزی بۆ دانا.

### ٢- دروست كردنی لەجوانترین شێوەدا:

خودای گەورە مرۆڤی لەجوانترین شێوەدا دروست كردووەو لەهەموو گیانەوەرانی دیكە شێوەی ڕێكترو جوانترە.

### ٣- ڕۆحی مرۆڤ بەشێكە لەرۆحی خۆی كە كردویەتیە جەستەی مرۆڤەوە:

خودای گەورە دەفەرموێت:(( فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا )) (التحریم١٢) بەمەش مرۆڤ بووە بەخاوەنی ڕێزێكی گەورەو بە ئاسانی دەتوانێت بگات بە خودا ئەگەر ئەو ڕۆحە بە تاوان پیس نەكات.

### ٤- هەموو بونەوەری خستۆتە ژێر دەستی مرۆڤ:

خودای گەورە دەفەرموێت:(( وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ)) (الجاثیة١٣) یەكێك لەرێزەكانی خودا بۆ مرۆڤ ئەوەیە كە بونەوەری خستۆتە خزمەت مرۆڤ، ئەویش بۆ ئەوەیە كە مرۆڤ لەدونیادا بە بەختەوەری بژیو بتوانێت بە باشی خودا بپەرستێت، خودا هەموو ئاسمانەكانو زەوی لەبەر مرۆڤ دروست كردووەو بە تایبەتیش زەوی كە بۆی ڕازاندۆتەوە بە هەموو جۆرە نیعمەتێك بۆ ئەوەی بە ئاسودەیی بژیو زەوی بە باشترین شێوە ئاوەدان بكاتەوە.

## ٥- پاراستنی كەرامەت وماڵ و ناموسی مرۆڤ:

ئیسلام جەخت دەكاتەوە لەسەر پاراستنی رێزو مافەكانی مرۆڤو حەرام كردنی خوێنو ماڵیو پاراستنی ناموسو شەرەفی. ئیسلام نەك هەر لەژیاندا پارێزگاری لەمافەكانی مرۆڤ دەكات، بەڵكو لەدوای مردنیش رێزی لێ دەگرێت وەك پێغەمبەری خودا دەفەرموێت: ((كسر عظم الميّت ككسره حياً))، **واتە:** شكاندنی ئێسكی مردوو، وەك ئەوە وایە بە زیندوویی بیشكێنیت.

## ٦- لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە هەموو مرۆڤەكان یەكسانن:

لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە هەموو مرۆڤەكان یەكسانن، جیاوازی نیە لەنێوان مرۆڤی سپیو رەش و پیاو و ئافرەت یان عەرەبو غەیرە عەرەب تەنها بە لەخودا ترسانو كاری چاكە نەبێت، پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموویت:((كلكم من آدم وآدم من تراب)). واتە: هەمووتان لە ئادەمنو ئادەم لە گڵ دروست كراوە.

لەئیسلامدا كە یاسای سزای تاوانباران دادەنرێت جیاوازی ناكرێت لەنێوان هیچ كەسێكداو كەس بۆی نیە بە ناوی ئاینو نەتەوەو شتی دیكەوە لەو سزایانە رزگاری ببێت.

## سێیەم - گشتگیری و جیهانی بوون:

**بنەماكانی گشتگیری ئیسلامیش ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگرێتەوە:**

١- واتە ئەم پەیامەی كە خودای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەكەی بۆ هەموو مرۆڤایەتییە لەسەر رووی زەوی هەتا رۆژی دوایی بەردەوام دەبێت، ئەم پەیامە تایبەت نییە بە عەرەب یان نەتەوەیەكی دیكە بەڵكو بۆ هەموو نەتەوەكانوگەلەكانو كیشوەرەكانە، لەئیسلامدا هیچ نەتەوەیەك هەڵبژێردراوی خودا نیە، خودا بە یەكسانی سەیری هەموان دەكاتو هەموویان ئەو دروستی كردوونو لەیەك رەگەزن، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: (( وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ))( سبأ ٢٨).

٢- شەریعەتی ئیسلام هەموو قۆناغەكانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە:ئیسلام سیستمێكی بۆ ژیانی مرۆڤ داناوە، كە لەناو سكی دایكیەوە دەیگرێتەوە، پاشان كە لەدایك دەبێتو دەبێتە منداڵو كە گەورە دەبێتو ژن دەهێنێتو دەبێتە دایكو باوك، هەتا پیر دەبێت هەروەها پاش مردنیشی رێنوێنی دەكاتو هەتا دەچێتە بەهەشت یان دۆزەخ.

## پرسیار:

**جگە لەو خاڵانەی باسکراوە ڕێزگرتنی ئیسلام بۆ مرۆڤ لەچی دیکەدایە؟**

## گفتوگۆ:

**لە ئیسلامدا خودای گەورە ڕێزی لە مرۆڤ گرتووە بەژنو پیاوەوە، بەڵام لەواقیعی ژیاندا زۆرجار دەبینین ئافرەتان بەچاوێکی کەمتر لە پیاوان سەیریان کراوەو ڕێز لە کەرامەتو هەستو مافەکانیان نەگیراوە کە ئەمەش دژی ئیسلامە ئەم جیاوازیەش لە نێوان ئیسلامو واقیعی کۆمەڵگە پێویستی بە چارەسەرە.**

## وانەی نۆزدەم:

### چوارەم- میانەڕەوی:

**ئاینی ئیسلام ئاینی میانڕەویە، واتە دژی توندڕەوی‌و شلگیریە لەیەك كاتدا، میانڕەویش لەئیسلامدا چەند مانایەكی هەیە:**

**١- ئیسلام شەریعەتێكی داد پەروەرە لەرووی دیاریكردنی ماف‌و ئەركەوە:**

لەم بارەیەوە پێغەمبەری خودا دەفەرموێت:((**إنما أُهلك الذين قبلكم انهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد وأيم الله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها**)).(متفق عليه).

**واتە:** خەڵكانی پێش ئێوە بەوە لەناوچوون ئەگەر خاوەن پلەو پایەو دەستڕۆیشتویەك دزی بكردایە وازیان لێی دەهێنا بەڵام ئەگەر زەبون‌و بیٚ پشتێك دزی بكردایە سزایان دەدا، سوێند بەخودا ئەگەر فاتیمەی كچی موحەمەد دزی بكات دەستی دەبڕم (سزای دەدەم).

**٢- ئاینێكی راستەو خواری تێدا نیە:**

ئیسلام رێگەیەكی راستە رێگەیەكی گومڕاو سەر لێشێواو نیە، مرۆڤ رێنمایی دەكات بۆ رێگەیەكی رۆشن كە لەدونیادا بە بەختەوەری بژی‌و لەقیامەتیشدا بە بەهەشت شاد ببێت.

**٣- ئاینێكە كە هەمووی خێرو چاكەو راستگۆییە:**

خودای گەورە دەفەرموێت:(( كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ)) (آل عمران ١١٠).

**٤- لەرووی عیبادەت‌و باوەڕەوە ئیسلام ئاینی میانڕەویە:**

لەئیسلامدا زۆربەی شتەكان حەڵاڵن بەڵام حەرامەكان كەم‌و سنوردارن.

**٥-ئیسلام ئاینی ئاشتیخوازی و برایەتی و بەیەكەوە ژیانی ئاشتیانەی گشت ئاین‌و نەتەوەكانە لە ژێر چەتری ئیسلامدا.**

## پێنجەم - واقیعی بوون:

واتە ئیسلام ئاینێکە بۆ مرۆڤ هاتووەو ڕەچاوکردنی هەموو ئەو بارو دۆخە دەکات کە تیایدا دەژی، لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا گونجاوەو لەپێناو بەختەوەری مرۆڤدا هاتووە.

ئیسلام ئاینێکە گرنگی دەدات بە غەریزەکانی مرۆڤو داوا دەکات لەچوارچێوەی شتە حەڵاڵەکاندا تێریان بکاتو لەبەرامبەریشدا لەخراپەکانو حەرامەکان دوربکەوێتەوەو خۆیو کۆمەڵگە توشی زیان نەکات.

## شەشەم - ئاسانی و ڕۆشنی:

ئەوەی ئیسلام لەئاینو باوەڕەکانی دیکە جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە ئیسلام، ئاینێکی ئاسانو ڕۆشنەو هەموو کەس لەهەموو ئاستێکدا بە ئاسانی تێی دەگەن، باس لەخودایەکی تاکو تەنیا دەکات کە هەموو لایەك دەبێت بیپەرستنو داوای پێویستیەکانی لێبکەن.

هەموو ئەوەی لەغەیب باس دەکرێت لەئاگرو دۆزەخو سیفەتەکانی خودا هەموو شتێکن کە مرۆڤ بە ئاسانی تێی دەگاتو هیچ ئاڵۆزیەکی تیادا نیە.

## پێشنیار:

چەند بەڵگەیەکی دیکە لەسەر واقیعی بوونی ئیسلام بهێنەرەوە؟

١-

٢-

٣-

## پرسیار:

میانەڕەو بوونی ئیسلام واتای چی دەگەیەنێت؟

## گفتوگۆ:

ئیسلام ئاینێکی جیهانییەو هی گەل و نەتەوەیەکی دیاریکراو نیە پەیوەندی ئەمە بەیەکسانی نەتەوەو مرۆڤەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە چیە؟

## وانەی بیستەم:

# چەمکی خواپەرستی لەئیسلامدا

**پەرستش لەئیسلامدا بریتییە لە رووکردنە خودا لەهەموو شتێکداو ملکەچ بوونە بۆ شەریعەتەکەی بەئازادی‌و خۆشەویستییەوە، ئەویش بەمەبەستی وەرگرتنی پاداشت‌و خودا لە خۆڕازی کردن‌و چونە بەهەشت، هەروەها خۆپاراستن لەسزاکانی‌و رزگاربوون لەئاگری دۆزەخ.**

## بنچینەکانی ئیسلام:

ئیسلام کۆمەڵێك بنچینەی گرنگی هەیە کە بە هۆیانەوە موسڵمانێتی لەواقعیدا دەچەسپێت‌و لەم رێگەیەشەوە مرۆڤی موسڵمان ملکەچ بوونی بۆ خودای گەورە دەسەلمێنێت.

### بنچینەی یەکەم- شەهادەت:

واتە ووتنی (أشـهد أن لاإله إلا الله وأن محمـدًا رسـول الله) **واتە:** دەبێت مرۆڤی موسڵمان بڕیار بدات کەبێجگە لە (الله) هیچ خودایەکی حەق نیەو(محمد) یش نێردراوی خودایە.

وتنی(لا إله الاالله) واتە: دەبێت بەوپەڕی یەقینەوە بڕوا بەگەورەیی خودا بکەیت‌و تەنها ئەو بە شایەنی پەرستن بزانیت، هەرئەوە کەهەموو بونەوەری لەژێر دەستدایەو ژیانی بەخشیوە بە زیندەوەران‌و مردنیش تەنها لەدەستی ئەو دایە.

مانای گەواهیدانیش کە(محمد) نێردراوی خودایە واتە دەبێت دان بنێین بەوەدا کە پێغەمبەر (د.خ) لەلایەن خوداوە نێردراوە بۆهەموو خەڵك بەبێ جیاوازی مژدە دەدات بەوانەی شوێنی دەکەون‌و ئەوانەش ئاگادار دەکاتەوە کەسەرپێچی دەکەن، پێغەمبەر (د.خ) دەیەوێت مرۆڤایەتی لەستەم وتاریکی دەربهێنێت‌و دەستیان بگرێت بەرەو رزگاری‌و سەرفرازی‌و گەیشتن بە رەزامەندی خودای گەورە.

قورئان لەلایەن خودای گەورەوە هاتووە، کە دوا پەرتوکی خودایە، پرۆگرامێکی تەواوو بێ کەم وکورتییەو لەپێناو خۆشکردنی ژیانی مرۆڤدا هاتووە، داوا لەمرۆڤایەتی دەکات کەکاری چاك بکەن‌و خۆیان برازێننەوە بە ئەخلاقی جوان‌و

بەئاسـودەیی بـژین، هـەروەها دەبێـت موسـڵمان بـاوەڕی وابێـت کەپێغەمبـەر (محمـد) (د.خ)دوا پێغەمبەرەو پێویستە هەموو مرڤایەتی شوێن ڕێبازەکەی بکەون.

## بنچینەی دووەم - نوێژ کردن:

هۆکارێکی پەیوەندییە لەنێوان بەندەو خودای گەورەدا، لەشەوو ڕۆژێکدا پێنج جار ئـەنجام دەدرێـت، کـە هەریەکـەیان کـاتی تایبـەتی خـۆی هەیـەو ژمـارەی ڕکاتـەکانی جیاوازن. مرۆڤ تیایدا بەملکەچی بەرەو قیبلە دەوەستێت و نوێژەکانی ئەنجام دەدات.

خودا دەفەرموێت (( وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ ))(البقرة٤٣).

لەحیکمەتەکانی نوێژ ئەوەیە کەمرۆڤی لاوازو هەژار پەیوەست دەکات بەخودایـەکی بـەهێزو خـاوەن توانـاو دەوڵەمەنـد، لەچـەند کـاتێکی تایبەتـدا لەسـەرقاڵیەکانی دونیـا ڕزگاری دەکات و خودای بیر دەخاتەوەو لە چەند کاتێکی دیاری کراودا ڕوو لـە خـودای بەسۆزو بەزەیی دەکات کـە لـە تاوانـەکانی ببورێـت و پشـتیوانی لێ بکـات بۆ سـەرکەوتن لەژیاندا.

(الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۝ الـرَّحْمنِ الـرَّحِيمِ ۝ مَلِـكِ يَـوْمِ الدِّيـنِ ۝ إِيَّـاكَ نَعْبُـدُ وإِيَّـاكَ نَسْتَعِينُ ۝) (الفاتحة ٢- ٥).

**واتـە:**سـوپاس بۆخـودای هـەموو جیهـان، بەسـۆزو بەزەییـە، پاشـای ڕۆژی دواییـە ، تەنها تۆدەپەرستین و تەنها پشت بەتۆ دەبەستین.

نوێــژ پەیوەندییــە بــەخودای گــەورەو زینــدوو بــەهێزو راســتگۆوە ،دڵ هێــزی لێ وەردەگرێـت و دەرون پێـی ئـارام دەبێـت و گیـانیش دڵ خـۆش وشـاد دەبێـت پێـی، پێغەمبـەری خـودا (د.خ) کاتێك توشـی ناخۆشیەك ببوایە یـان هەسـتی بەنیگەرانییـەك بکردایە دەیفـەرموو (هەسـتە بیلال بەنوێـژ ئاسـوودەمان بکـە)واتـە: بـانگ بـدە بۆ نوێـژ. هـەروەها لەفەرمودەیەکدا دەفـەرموێت:( لـەدونیادا سـێ شـت زۆر لام خۆشەویسـتن ژن وبۆنی خۆش، بەلاَم خۆشترین شت بەلاشمەوە نوێژکردنە).

لەوخۆشـترین شـتە مەبەسـتی ئـەوەبوو کـە سەرچـاوەی هـەموو خۆشـی وئـارامی وهێمنی وجوانیەك تەنها لە نوێژدایە وە مەبەستیش لە خۆشەویستی ژن ڕێزلێگرتنە.

نوێـژی ڕاسـت و تـەواو کـە بـە لـە خـودا ترسـانەوە بکرێـت ئـارامی وخۆشـبەختی دەهێنێـت بۆدەرووونی خاوەنەکـەی و هەسـت بەپشـتوانی خـوای گـەورە دەکات وژیـان

بـەجوانی دەبینێـت و هەسـت دەكـات لەكارەكانیـدا سـەركەوتوە و بەئاسـانی بەسـەر كۆسپ و تەگەرەكانی ژیاندا سەردەكەوێت.

بنچینەی سێیەم – زەكات:

واتە سالآنە بەشێك لەماڵو سامان دەر دەكرێت، ئەویش بەپێی یاسایەكی تایبەتییە لەشەریعەتدا دیاری كراوەو، (٢,٥٪) دەست پـێ دەكات ،بـەلام لـە (١٠٪) تێپـەڕ ناكات، ئەم زەكاتە كـە لـەماڵو سـامان دەردەكرێت ،دەدرێت بـە چـەند چینو توێـژێكی هـەژارو كەم دەرامەتی كۆمەڵگە .

بنچینەی چوارەم – ڕۆژوو:

ئەمەش جۆرێكە لەعیبادەت لەمانگی ڕەمەزاندا كە بریتییە لەخۆگرتنەوە لەخواردنو خواردنەوە لە نوێژی بەیانیەوە هەتا ڕۆژ ئاوابوون. **خودا دەفەرموێت**:((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ))(البقرة١٨٣).

**سودەكانی ڕۆژوو لەرووی ماددیو مەعنەوییەوە:**

**١ – ڕاهێنانی مرۆڤ لەسەر ئارام گرتنو برسیەتیو تێنوێتی.**

**٢ – كۆمـەڵێك سـودی هەیـە لـەبواری تەندروسـتییەوە، وەك ڕزگـار بـوون لـەژەهراوی بوونو چاك بوونی كۆئەندامەكانی دەمارو هەرسو هەناسەدان.**

**٣ – پـاك كردنـەوەی دڵـەكانو ئـاوەدان بوونـەوەیان بـە بـاوەڕو لەخوداترسـانو خۆشەویستی خودا.**

**٤ – دەبێتە مایەی پاك بوونەوەی مرۆڤ لە تاوانو بەم هۆیشەوە هەست بە ئارامیو دڵخۆشی دەكات.**

بنچینەی پێنجەم – حەج:

واتە سەردانی ماڵی خودا بكەیت لەمەككە بۆ بەجێ هێنانی هەندێك كـاری دیـاركراو بە مەبەستی خودا پەرستی، ئەمەش كاتێكی دیاری كراوی خۆی هەیە، ئەم عیبادەتـە تـەنها یـەك جـار لـە ژیانـدا واجیبـە ئـەنجام بدرێت، حـەج كـردن سـوننەتێكی ئیـبراهیم پێغەمبەرەو موسڵمانان هەموو ساڵێك تازەی دەكەنەوە.

حەج کۆنگرەیەکی ساڵانەیە، هەموو موسڵمانان لەسەرتاسەری گۆی زەوی لەهەموو رەنگ‌و نەتەوەیەکی جیاواز کۆدەبنەوە، لەم کۆنگرەیەدا ئاڵوگۆڕی دیدو بۆچوون دەکەن لەسەر زۆر کێشەی جیهان، لەم رێگەیەوە بوونی پەیوەندی نێوان گەلە موسڵمانەکان بەهێز دەبێت‌و هاوکاری یەکدی دەکەن‌و سوود لەئامۆژگاریەکانی یەکدی وەردەگرن‌و لەبارودۆخی گشتی موسڵمانان لەجیهاندا شارەزا دەبن.

**پرسیار:** بۆچی بەوشتانەی باسکران دەوترێت بنچینەکانی ئیسلام؟

## وانەی بیست ویەکەم:

# مانای موسـڵمانێتی

موسڵمان ئەو کەسەیە کە شایەتی بدات بێجگە لە(الله) هیچ خودایەکی دیکە نیەو (محمد)یش(د.خ) پێغەمبەری خودایە، لەم روانگەیەوە دەتوانین پەیوەندی موسڵمان بە ئیسلامەوە بکەین بە دوو جۆر:

### یەکەم - ئیسلامی رووکەش:

واتـە موسـڵمان بـوونێکی سـادەو رووکـەش کـە باوەڕەکـەی نەچـووەتە قـوڵایی دەروونیـەوەو کاریگـەری لەسـەر رەوشـتی نیـەو لەگـەڵ ژیانیـدا ئاوێتـە نـەبووەو لەپەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا رەنگی نەداوەتەوە، چونکە ئینتیمایەکی رووکەشی هەیە بۆ ئیسلام یاخود بە شێوەیەکی کوێرانەو چاولێکەری ئیسلامی وەرگرتووە.

ئـەم جـۆرە موسـڵمانە، ناتوانێـت بـە باشـی کـەڵك لەبـەهاو بنـەماکانی ئیسـلام وەربگرێت و بێبـەش دەبێت لەجەوهـەری ئیسـلام، لـە رووی دەرونییـەوە ئـەم کەسـە هەست بـە هـەموو خۆشییەکانی خواپەرستی ناکات و زۆر بـە ئاسـانی روو لـەتاوان و خراپـەکاری دەکـات و خۆشەویسـتی خـودا لەدڵیـدا لاوازەو زۆر هەسـت بـە گرنگـی دوارۆژیش ناکات.

### دووەم - باوەڕدار:

ئـەو موسـڵمانەیە کـەباوەڕی لەسـەر بنـەمای بڕوابـوون و تێگەیشـتنی تـەواو دامەزراوەو، لەژیانیشیدا بەپێی شـەریعەت و پـەیامی خـودا هـەنگاو دەنێت، ئەم جۆرە تێگەیشـتن و بـڕوا هێنانـەش ناودەبرێـت بـە باوەڕهێنـان، ئـەو موسـڵمانەش کـە پەیوەندییەکی بەهێزی لەو جۆرەی لەگەڵ خودادا هـەبێت و پابەند بێت بە ڕێساکانی شەریعەتەکەی پێی دەوترێت (**مؤمن**) واتە باوەڕدار.

بەم جۆرە بۆمـان دەردەکـەوێت کـە باوەڕهێنـان پلەیـەکی بـەرزترە لەئیسـلام، چونکە بڕوابوونێکی راستگۆیانەو هۆشیارانەیە لەئیسلام و لەدوایشدا لەژیانی رۆژانەی خۆیدا جێبەجێی دەکات، لەرێگەی ئەخلاق و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و عیبادەتەکانەوە.

قورئان زۆر بە روونی باسی ئەم دوو قۆناغە دەکات، خودای گەورە داوا لەموسڵمان دەکات کە لەپلەی دووەمدا بێت، واتە باوەڕداربێتو ملکەچی فەرمانەکانی خودا بێت، نەك تەنها موسڵمانێکی رووکەش بێتو بێ ئاگابێت لەیاساو رێساکانی ئیسلام.

لە روانگەی قورئانەوە موسڵمانی راستەقینە پێویستە بە ئازادی خۆی ئاین هەڵبژێرێتو بە ئیرادەی خۆی ملکەچی ویستو ئیرادەی خودا بێت، خودای گەورە لەبارەی موسڵمان بوونی حەزرەتی ئیبراهیم دەفەرموێت:((**إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ**)) (البقرة ١٣١ ).

**واتە:** خودای گەورە بە حەزرەتی ئیبراهیمی فەرموو موسڵمان بە، ئەویش ووتی من بە هەموو شتێکم ملکەچی فەرمانەکانی خودابووم.

قورئان بەم شێوەیە باسی موسڵمانی راستەقینە دەکاتو دەیەوێت باوەڕێکی پاكو بێگەردی هەبێت کە لەسەر بنەمای هۆشیاریو تێگەیشتن بنیات نرابێتو رەوشتو مامەڵەی رۆژانەشی ببێتە واقیعی باوەڕەکەی.

ئیسلام ئاینێکە دەیەوێت مرۆڤ لەدونیاو دوا رۆژدا بەختەوەر بێت، چونکە پەیامەکەی لەپێناو خۆشبەختی مرۆڤدا هاتووە، هەتا رێنماییان بکات بۆ رێگەی چاکەو لەتاوانو خراپەکاری بەدووریان بخاتەوە، پێغەمبەری خوداش(د خ) لەفەرموودەیەکدا دەفەرموێت:((**من بۆ خێری دونیاو دوارۆژی ئێوە هاتووم**)).

## وانەی بیست و دووەم:

# پایەو سیفەتەکانی گەنجی موسڵمان لە ئیسلامدا

**قۆناغی گەنجی لە ژیانی مرۆڤ و لە روانگەی ئیسلامیشەوە قۆناغێکی یەکجار گرنگە، بۆیە لێرەدا هەندێك ئاماژەی تایبەتی پێ دەکەین:**

١- گەنجی موسڵمان پێویستە گەنجێکی دەرون پاکی بەڕێزی خاوەن رەوشتی جوان بێتو پێغەمبەری خودا بکاتە سەر مەشقی خۆیو لە رەوشتە بەرزەکانی بەهرەمەند بێت.

٢- گەنجی موسوڵمان پێویستە باوەڕێکی پاكو جوانی هەبێتو خۆشەویستی خودا لەدڵیدا جێگیر بێتو خودای گەورە بە باشی بپەرستێتو لەفەرمانەکانی لانەدات.

٣- پێویستە گەنجی موسڵمان شارەزاییەکی باشی لەئیسلام هەبێتو بە هۆشیارییەوە ئاین وەربگرێتو بە عەقڵێکی کراوەوە مامەڵە بکاتو بۆ خزمەتی خۆیو خێزانو کۆمەڵگەکەیو گەلو نەتەوەکەی بەکاری بهێنێت.

٤- گەنجی موسڵمان پێویستە گەنجێکی داوێن پاكو رەوشت بەرز بێتو خۆی لەکاری خراپو تاوانکاریو لادان بپارێزێتو خو نەداتە ماددە هۆشبەرەکانو خواردنەوەی مەیو جگەرەکێشان، چونکە هەموو ئەمانە دەبنە مایەی زیان بۆ تەندروستی مرۆڤو کاریگەری خراپی بۆ سەر بواری ژیانی تاکەکەسیو خێزانی و کۆمەلایەتی هەیە سەرەرای ئەوەی حەرامیشن.

٥- گەنجی موسڵمان دەبێت کەسایەتیەکی دامەزراوو بەرێزو بە ئارام بێت وخۆی لەهەموو ئەو شتانە بپارێزێت کە زیان بە کەسایەتی دەگەیەنن.

٦- گەنجی موسوڵمان دەبێت کەسێکی چالاك‌و خاوەن بەرنامە بێت بۆ ژیانی خۆی‌و بەرەو ئایندە هەنگاو بنێت‌و خاوەن پلان بێت بۆ ژیانی خۆی، هەتا پاشە ڕۆژێکی باش بنیات بنێت.

٧- لەگەڵ دایبابیدا دەبێت نمونەی سۆزو بەزەیی‌و ڕێز بێت، هاوکاریان بکات‌و ئازاریان نەدات‌و گوێڕایەڵی فەرمانە چاکەکانیان بێت‌و هاوکارێکی دڵسۆز بێت بۆیان.

٨- پێویستە گەنجی موسوڵمان دونیا بە کێڵگەی دواڕۆژ بزانێت‌و ژیانی دونیا بە فرسەت بزانێت بۆ خواپەرستی‌و کاری چاکەو هاوکاری‌و دڵسۆزی‌و هەوڵدان بۆ ئەوەی لەدواڕۆژدا بە بەهەشتی بەرین شاد بێت.

٩- گەنجی موسوڵمان پێویستە دڵسۆزی گەل‌و نەتەوەکەی بێت‌و کوردستانی خۆش بوێت‌و لەهەوڵی ئاوەدان کردنەوەو بەرەو پێشچونیدا کار بکات‌و خۆشەویستی بۆ سەرجەم گەلانی موسڵمان‌و مرۆڤایەتی بوێت.

١٠- کاتەکانی لەشتی بێ هودەدا بەسەر نەبات‌و هەوڵ‌و کۆشش بکات‌و خوێندن بە خواپەرستی بزانێت‌و بە خۆشەویستییەوە درێژە بە فێربوونی بدات.

## وانەی بیست و سێیەم:

**قوتابی خۆشەویست لەم بەشەدا باسی دوو بەهای بەرزی ئیسلام دەکەین کە بریتین لە (خۆشەویستی و لێبوردەیی).**

### یەکەم – خۆشەویستی:

خۆشەویستی بنەمای ژیانەو ئەگەر خۆشەویستی نەبێت ژیان نابێت، خۆشەویستی هەستێکی ناسكو جوانە لەدڵدا جێگیر دەبێتو تیشکی خۆی بە هەموو لایەکدا پەخش دەکاتەوە.

خۆشەویستی هەستێکی ناسکی پڕ لەسۆزو پەرۆشی لەدڵو دەرونەوە هەڵدەقوڵێت ژیان بەبێ خۆشەویستی هیچ مانایەکی نیەو بێ چێژی خۆشەویستی مرۆڤ ناتوانێت وەك کەسێکی زیندوو بژیو کاریگەری جوانو باشی لەژیاندا هەبێت. دڵێکیش خۆشەویستی تێدا نەبێت وێرانەیە. خۆشەویستی سۆزێکی قوڵو پاك و پرشنگداری ناو دەروونە. خۆشەویستی وامان لێ دەکات چێژ لەژیان وەربگرینو ئاسودەو کامەران بینو دڵو دەرونمان بحەسێتەوەو چاکەمان بۆ مرۆڤەکانی دیکە بوێتو بەسۆزو بەزەییو گیانی لێپرسراوێتییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین.

**رەگەزەکانی خۆشەویستی:**

**خۆشەویستی لانی کەم سێ رەگەزی هەیە:**

**١–هەست بەلێپرسراوێتی:** واتە مرۆڤ هەست بەلێپرسراوێتی دەکات بەرامبەر ئەو کەسە یاخود ئەو شتەی خۆشی دەوێت و پەرۆشیەتی.

**٢–رێزگرتن:** خۆشەویستی رێزگرتن بەرهەم دەهێنێت، واتە یەکێك لەبەرەکانی درەختی خۆشەویستی رێزە، مرۆڤ رێز لەخۆشەویست دەگرێت و بەگەورەیی و شایستەوە سەیری دەکاتو مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و بێ رێزی بەرامبەر ناکات.

**٣–بەخشندەیی:** خۆشەویستی سەرچاوەی بەخشندەییو قوربانی دانو بەهێزکردنی گیانی خۆبەخشییە. مرۆڤ بەرامبەر ئەو کەسو شتەی خۆشی دەوێت دەبێت بەخشندە بێت.

**بایەخ دانی ئیسلام بە خۆشەویستی:**

(ئاین) بەگشتیو بەتایبەتی ئاینی ئیسلام گرنگیەکی زۆری داوە بەخۆشەویستیو هەوڵدەدات ئەم بەها جوانە لەناوماندا بڵاوببێتەوەو ژیانمان برازێنێتەوەو بەگیانی خۆشەویستیو میهرەبانیو برایەتییەوە مامەڵە لەگەڵ خۆمانو خێزانو کۆمەڵگەو

دەوروبەر بکەین. بەڵکو بە چاوی خۆشەویستییەوە سەیری ژیان بکەین و لەوەش ئاگاداربین موسڵمانی راستەقینە دەبێت هێمای خۆشەویستی بێت، لە دڵرەقی و رق و کینە بەدوور بێت، چونکە خواپەرستی و ئاینی بێ خۆشەویستی. جەستەیەکی بێ گیانەو خاوەنەکەی سودو چێژی لێ وەرناگرێت. بەڵکو مەترسی ئەوەشی لێ دەکرێت بەپێچەوانەی ئامانجەکانی ئیسلام خراپ سوودی لێ وەربگیرێت و ببێتە هێزێکی روخێنەر.

## پلەو پایەی خۆشەویستی لە ئیسلامدا:

لە (٨٤) شوێنی قورئاندا وشەی خۆشەویستی و ئەو ووشانەی لەو وەرگیراوە ئاماژەی پێ کراوە ئەمەش ئەو بایەخە گەورەیە دەردەخات کە ئیسلام بۆ ئەم بەهایەی داناوە هەر ئەمەشە وای کردووە پەیوەندییەکی قوڵی بە باوەڕو کەسێتی و بیرکردنەوەی مرۆڤی موسڵمانەوە هەبێت و ببێتە پێوەرێکی گرنگی بوونی باوەڕ.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێت خۆشەویستی رێبازی هەموو موسڵمانێك بێت لە ژیاندا.

لە فەرمودەیەکدا خۆشەویستی و بەتایبەتیش خۆشەویستی موسڵمانان بۆ یەکدی دەکات بەمەرجی رەزامەندی خودای گەورەو کلیلی چوونە بەهەشت هەروەك دەفەرموویێت:((**لن تدخلوا الجنَّة حتى تؤمنوا ولن تؤمنوا حتى تحابوا؛ الا أدلُّكم على شيءٍ إذا فعلتموه تحاببتم، افشوا السَّلامَ بينكم**)). **واتە:** کەستان ناچنە بەهەشتەوە تا باوەڕ نەهێنن، وە بە باوەڕداری تەواو لە قەڵەم نادرێن تاکو یەکدیتان خۆش نەوێت، ئایە شتێکتان نیشان بدەم ئەگەر کردتان یەکدیتان خۆشبوێت؟ (سڵاو لە یەکدی بکەن)و خێرو خۆشی و بێ وەیی یەکدیتان بوێت و کەستان مەبەستی ئازاردانی ئەوی دیکە نەبێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە موسڵمان دەبێت زۆر پەرۆشی مەسەلەی خۆشەویستی و میهرەبانی بێت، چونکە پەیوەستە بە مەسەلەی چارەنووسی کۆتایی و چوونە بەهەشت، پێغەمبەر (د.خ) لە فەرمودەیەکی دیکەدا دەفەرموویێت: (**لا يؤمن احدكم حتى يحب لأخيه ما يُحب لنفسه**) **واتە:** کەستان بە باوەڕدار ناژمێردرێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ خوشك و برا موسڵمانەکانی و هاوڵاتیانی دیکەش پێی خۆش نەبێت.

بۆ ئەوەی مرۆڤ لە مامەڵەکردن و حوکمدان بەسەر کەسانی دیکەشدا دووچاری هەڵەو تاوان نەبێت دادپەروەری وا دەخوازێت خۆی بخاتە شوێنی بەرامبەرەکەی،

ئەوكاتە بیر بكاتەوە ئەگەر تۆ لە شوێنی ئەو دابێت حەز دەكەیت چ جۆرە مامەڵەیەكت لەگەڵدا بكرێت، بۆ ئەوەی بەو جۆرە مامەڵە بكەیت و بجوڵێیتەوە.

ئیسلام لە كاتێكدا كە ئەم جەختە زۆرە لەسەر خۆشەویستی دەكاتەوەو دەیەوێت بیكات بە یەكێك لە خەسڵەتەكانی مرۆڤی موسڵمان و كۆمەڵگەی لەسەر پێ بگەیەنێت، لە هەمان كاتدا بەسەختی رووبەرووی بوغزو رق و كینە دەوەستێتەوە كە دژی خۆشەویستین.

پێغەمبەر (د.خ) لە فەرموودەیەكدا دەفەرموێت:( اياكم والبغضاء...) واتە: خۆتان لە بوغزو كینە بە دوور بگرن، هەروەها دەفەرمووێت: (ولاتباغضوا) **واتە:** رقتان لە یەكدی نەبێت. مرۆڤ دەبێت رقی لە ستەم و خراپەكاری و تاوان و ناعەدالەتی بێت و نابێت بەرامبەر هاو ئاین و هاوڵاتیانی خۆی دڵی پڕ بێت لە بوغزو كینە، چونكە درەختی باوەڕ رەگی لەناو خۆشەویستی و میهرەبانی و لێبوردن و برایەتیدایە. زانای بەناوبانگی كوردیش مامۆستا سەعیدی نۆرسی لە وتەیەكیدا دەڵێت:((ژیانی دونیا زۆر لەوە كورترە پڕ بەدڵ یەكترمان خۆشبوێت چ جای رقمان لە یەكدی بێت و بە چاوی دوژمنایەتیەوە سەیری یەكدی بكەین)).

## جۆرەكانی خۆشەویستی:

### خۆشەویستی چەندین جۆری هەیە لەوانەش:

### ١ - خۆشەویستی بۆ خودای گەورە:

دیارە لە روانگەی ئیسلامەوە پەیوەندی نێوان خودای میهرەبان و بەندەكانی لەسەر بناغەی خۆشەویستی دامەزراوە هەر بە سروشت و لەمنداڵیەوە، مرۆڤ لەدڵیدا خۆشەویستییەكی گەورەی بۆ خودا هەیە، ئەگەر لەگەڵ گەورە بوندا چەندەها ئایەت لەقورئاندا جەخت لەم پەیوەندییە دەكەنەوە هەر وەكو خودای گەورە دەفەرموێت: ((إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا))(مریم ٩٦).

**واتە:** باوەڕدارانی چاكەكار خودای میهرەبان لەخۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی خۆیانی پێ دەبەخشێت. هەروەها دەفەرموێت:(( وَاسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ)) (هود ٩٠)، **واتە:** داوای لێ خۆشبوون لەپەروەردگارتان بكەن و بگەڕێنەوە بۆلای ئەو، بەڕاستی پەروەردگارم یەكجار میهرەبان و بە بەزەیی و دلۆڤانە.

مرۆڤی باوەڕدارو خواناس ئەو خۆشەویستییەی بۆ خودا زیاد دەكات، مرۆڤ هەتا خواپەرستی و خێرو چاكەی زیاد بكات زیاتر لەخودا نزیك دەبێتەوە.

بەهۆی ئەمەشەوە خۆشەویستی خودا لەدڵیدا زیاد دەکات ئەویش زیاتر خودای خۆش دەوێت، خودای گەورە لەفەرموودەیەکی قودسیدا کە ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە کە کە پێغەمبەر(د خ) فەرموویەتی:((... **ومايزال عبدي يتقرب اليَّ بالنوافل حتى احبه فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به وبصره الذي يبصر به...**)) ((**بەندەم بە کردنی سوننەتەکان لە من نزیك دەبێتەوە، ئەو کاتەش خۆشم دەوێتو دەبم بەو گوێیەی گوێی پێ دەگرێت و دەبم بەو چاوەی پێی دەبینێت**)).

خودای گەورە لەباسی سیفاتی موسڵمانیشدا دەفەرموێت:(( وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلّهِ)) (البقرة ١٦٥). **واتە:** ئەوانەی بڕوادارن زۆرترین خۆشەویستیان بۆ خودا هەیە.

## ٢ – خۆشەویستی پێغەمبەران:

خۆشەویستی پێغەمبەرانیش لقێکە لەخۆشەویستی خودا جیا بووەتەوە، وەك خودای گەورە دەفەرموێت:(( قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ))(آل عمران ٣١)، **واتە:** خۆشەویستی خودا بۆ موسڵمان بە شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەرەکەیەتی، هەموو کەسێکیش کە پێغەمبەری خۆش بوێت دەکەوێتە شوێن ڕێبازەکەی ،ئەو کاتە خوداش خۆشی دەوێت، پێغەمبەران پردی پەیوەندین لەنێوان خوداو خەڵکدا، هۆکاری ڕێنمایی هاولاتیانن بۆ ڕێبازی رزگاریو چاکەو خێر، لەئاگر دەیان پارێزێتو بەرەو بەهەشتیان دەبات، لەبەر ئەوە شایەنی هەموو خۆشەویستیەکن لەم نێوەندەشدا دەبێت خۆشەویستییەکی گەورەمان بۆ پێغەمبەرمان (موحەمەد) (د.خ) هەبێت چونکە خۆی دەفەرموێت باوەڕتان تەواو نابێت هەتا منتان لەماڵ و منداڵو خۆشتان زیاتر خۆشنەوێت. چونکە ئەو خۆشەویستی خودایەو خودای گەورە داوای لێ کردووین خۆشمان بوێت.

## ٣ - خۆشەویستی مرۆڤ بۆ خۆی:

هیچ مرۆڤێك نییە کە خۆی خۆش نەوێت، بەڵکو گرنگترین شت لای مرۆڤ پێویستە خۆی بێت، چونکە ئەگەر خۆی خۆش نەوێت گرنگی پێ ناداتو نای پارێزێتو بەرەو تیاچوونی دەبات، ئەم جۆرە خۆشەویستییە کە لەدڵی هەموو کەسێکدا هەیە، خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾(المائدة١٠٥) **واتە:** گرنگی بە خۆتان بدەن، هەڵبەت دەبێت بزانین ڕێز لەخۆگرتنو خۆخۆشویستن لەخۆپەرستی جودایەو ئەوەی دووەم رەوشتێکی ناشرینەو ئیسلام دژایەتی دەکات.

## ٤ - خۆشەویستی بۆ شتی بەرجەستەو ماددی:

وەك خۆشەویستی بۆ هەندێك جۆری خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگی جوان، هەندێك لەم خۆشەویستیانە لەڕێگەی چاوەوە دیاری دەكرێت وەك دیمەنێكی سروشتی، وێنەیەكی جوان، مرۆڤێكی جوان، یان سەرسام بون بە شوێن كارەكانی دروست كراوەكانی خودای گەورە وەك سەیركردنی ئەستێرەكانو چۆنیەتی دروست كردنی مرۆڤو گیانەوەرانی دیكەو هەورو گوڵو بارانو بەفرو زۆر شتی دیكە.

یان لەرێگەی گوێوە دەبێت وەك خۆشەویستیت بۆ گوێ گرتن لەدەنگێكی خۆش، هۆنراوەیەكی بە جۆش، گۆرانیەكی سەرنج راكێش، شەپۆلێكی ئارام یان قورئان خوێنێكی باش، یان بەدەست لێدانی شتێكی جوان یان لەباوەش گرتنی منداڵێك، یان دایكو باوك بۆ منداڵەكەیان، یان هاوڕێیەك بۆ هاوڕێكەی.

## ٥ - خۆشەویستی دایك و باوك بۆ منداڵەكانیان:

ئەو خۆشەویستیەیە كە خودای گەورە لەدڵی دایكو باوكدا بۆ منداڵەكانیان دروستی كردووە، كە تیاییدا هەموو هەستو سۆزو بەزەییەكی هەیە بۆیان، خۆیان توشی ئەو پەڕی ناخۆشیو ئازارو گرفت دەكەن، تەنها بۆ ئەوەی ئەوان سەركەوتووبن لەژیاندا، خودای گەورە خۆشەویستی منداڵی كردۆتە بەشێك لەسۆزی خۆی لەدڵی دایكو باوكدا، كە ئەمەش خۆشەویستی راستەقینەیە، چونكە دایكو باوك ئازار دەكێشن لەپێناویداو ئامادەی هەموو قوربانیدانێكن. لەبەر ئەوە پێویستە منداڵەكانیش ئەو خۆشەویستیە بە هەند وەربگرنو ئەوانیش بەرێزەوە سەیریان بكەنو ئەو پردی خۆشەویستییە بە تێن بكەن، هەتا خێزانەكان بە ئارامی بژین.

## ٦ - خۆشەویستی ژن و پیاو بۆ یەكدی:

خودای گەورە لە رێگەی شەریعەتەكەیەوە خۆشەویستی مرۆڤی نێرو مێی پشت گوێ نەخستووەو، هەر كاتێك كوڕو كچێك یەكدیان خۆشویست دەتوانن لە رێگەی دروستكردنی خێزانەوە بە یەكدی بگەن، لەخێزانیشدا خۆشەویستی ژنو پیاو رۆژ بە رۆژ بۆ یەكدی زیاد دەكاتو وای لێ دێت كە ئامادەی هەموو قوربانیدانێك بن بۆ یەكدیو هەردووكیان لەپێناو بنیات نانی خێزانێكی سەركەوتوودا هەوڵ بدەنو پاشان بوونی منداڵیش زیاتر خۆشەویستییەكەیان زیاد دەكاتو لەم رێگەیەشەوە هەوڵ دەدەن كە تاكێكی بە سود پێشكەش بە كۆمەڵگە بكەن بە پەروەردەكردنی منداڵەكانیان بە شێوەیەكی دروست.

خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو لەئیسلامدا زۆر پیرۆزەو نابێت هیچیان خیانەتی لێ بکەن و هەر کەسێکیش خیانەت لەم خۆشەویستییە بکات ئەوا بەرەورووی سزای خودای گەورە دەبێتەوە، پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین کەهەر خۆشەویستییەکی (عاتفی) نێوان کوڕو کچ ئەگەر مەبەست تیایدا پێکەوە نانی ژیانی خێزانی نەبێت و رەوشت و پێوەرە ئیسلامییەکانی تیادا نەپارێزرێت پەسەند نیەو حەرامە، قوتابیانی خۆشەویست دەبێت لەگەڵ هاوپۆلەکان و هاوڕەگەزەکانیاندا لەقوتابخانەو کۆمەڵگەدا بەگیانی خوشك و برایەتی و هاوپۆلی و هاوقوتابخانەیی و هاوڕێی خوێندن مامەڵە لەگەڵ یەکدی بکەن، سەیری یەکدی بکەن و هەریەکەیان رێز لەکەسێتی و کەرامەت و ناوبانگی ئەوی دیکە بگرێت و خۆیان بۆ سەرکەوتن لەخوێندن و خوێندنەوەو چالاکی بەسود سەرقاڵ بکەن هەروەها هەرکەسێك چی بۆ خوشکەکەی یاخود براکەی خۆی پێ خۆشە بۆ هاوڕی کچ و کوڕەکانیشی پێی خۆش بێت. چونکە لەئیسلامدا کچان و کوڕان خوشك و برای یەکدین و وەك باسیشکرا چیمان بۆخۆمان پێ خۆشە دەبێت بۆ خوشك و برا موسڵمانەکان و هاوڵاتیانی دیکە پێمان خۆشبێت.

## ٧ – خۆشەویستی بۆ رەوشت و کاری چاکە:

چاکەو جوامێری و دەست گرۆیی و هاوکاری و رێزگرتنی بەرامبەرو دڵپاکی و داوێن پاکی و ئازایەتی وسەخاوەت و مامەڵەی جوان، ئەمانە کۆمەڵە رەوشت و هەڵسوکەوتێکن کە لای هەموو مرۆڤێکی ژیر جێگەی رێزو خۆشەویستین و هەر کەسێك هەڵگری ئەو سیفاتانە بێت لەلای خەڵك خۆشەویستە، لەبەر ئەوە پێویستە ببینە مرۆڤێك کە خەڵك خۆشی بوین، دەبێت هەوڵ بدەین هەموو رەوشتێکی جوان لەخۆماندا بەرجەستە بکەین هەروەها دەبێت چاکە کارانمان خۆشبوێت، چونکە خودای گەورە خۆشی دەوێن و دەفەرموێت:(( وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ))(المائدة ٩٣– آل عمران ١٣٤ و١٤٨).

واتە: خودای گەورە چاکەکارانی خۆشدەوێت.

## بۆچی دەبێت (محمد) پێغەمبەرمان(د خ) خۆش بوێت؟

ئەو هۆکارانەی کە وامان لێدەکەن پێغەمبەرمان خۆش بوێت زۆرن، بەڵام ئێمە چەند خاڵێکی گرنگیان لێ باس دەکەین:

أ – چونکە ئێمە بە هۆی ئەوەوە رێنمایمان وەرگرتووەو موسوڵمان بووین، لەم رێگەیەشەوە لە گومڕایی بەدوور بووین و دڵمان بە روناکی باوەڕ رۆشن بۆتەوەو بەرەو رێبازی چاکە رێنمایی کردوین و لەکوفرو هاوڵ دانان بۆ خودا رزگارمان بووە، ئاشنای

کردوین بە رێگەی راستو رێگەی چوون بۆ بەهەشتو رێگەی چوونە ئاگری پێ ناساندینو ئێمەش بە کردەوەی چاکەو خواپەرستی پێویستە خۆمان لێ بپارێزین.

ب –خۆشەویستی پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئێمە، لەناو دڵی پێغەمبەری خودادا(د.خ) خۆشەویستییەکی گەورە بۆ ئێمە هەبووە، تەنانەت بۆ ئەو موسڵمانەش کە ئەو نەیبینیون، جارێکیان پێغەمبەری خودا(د.خ) فەرمووی:(خۆشەویستانم، خۆشەویستانم) هاوەڵەکانی ووتیان ئەی ئێمە خۆشەویستی تۆ نین؟ فەرمووی:(نا، ئێوە هاوەڵی منن، خۆشەویستەکانم ئەوانەن کە منیان نەدیوەو بڕوایان بە من هێناوە) پێغەمبەری خودا(د.خ) زۆر غەمبار دەبوو، زۆریش دەگریاو ئازاری دەچەشت بۆ ئەو موسڵمانانەی کە بە جوانی خواپەرستی ناکەن، یان ئەوانەی کە ناکەونە شوێن رێبازەکەی، ئەگەر موسڵمانان ئەوە بزانن کە پێغەمبەر(د.خ) چەند لەخەمی ئەواندا بووە ئەوا ئەمان زۆرترین خۆشەویستیان بۆی دەبێت هەست بە شەرمەزاری دەکەن لە ئاست ساردیو کەمتەرخەمییان بەرامبەر بە ئاینەکەی، خودای گەورە لەئایەتێکدا دەفەرموێت:(( بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ)) (التوبة١٢٨)، **واتە:** پێغەمبەر(د.خ) بەرامبەر بە بڕواداران دڵسۆزو بە بەزەییە.

پ – سووربوونی لەسەر پاراستنی موسڵمانان: پێغەمبەری خودا(د.خ) زۆر لەخۆمان دڵسۆزترە بۆمان بۆ ئەوەی لەئاگری دۆزەخ بمان پارێزێت، بانگمان دەکات بۆ ئەوەی لەدونیاو دوا رۆژدا بە بەختەوەری بژین، نموونەش بۆ ئەم سووربوونەی ئەو فەرموودەیەیە کە ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە کە دەفەرموێت:(منو گەلەکەم وەك ئەوە وایە پیاوێك ئاگرێکی کردبێتەوەو بەردەوام زیندەوەرو پەپولە بیانەوێت خۆیان بخەنە ناوی، بەڵام من دەمەوێت دەستیان پێوە بگرمو نەیەڵم بەڵام ئەوان هەر هەوڵدەدەن خۆیان بخەنە ناوی).

هەروەها یەکێکی دیکە لەخەمخۆریەکانی بۆ ئێمە ئەوەیە کە لە رۆژی دواییدا شەفاعەتمان بۆ دەکات بۆ ئەوەی لەئاگری دۆزەخ بمان پارێزێت، لەبەر ئەوە ئەگەر سەرنج بدەین پێغەمبەری خودا(د.خ) زۆر لەخەمی ئێمەدا بووەو بەردەوام نزای بۆ کردووینو لە رێگەی پەیامەکەشیەوە ویستوویەتی ئێمە باوەڕدارو خواپەرست بینو لەگومڕایی بەدوور بین، ئەگەر لەم هەموو خەمخۆریەوە بۆ ئێمە سەیر کەین ئایە ئەو پێغەمبەرە شایەنی ئەوە نیە کە هەمووومان خۆشمان بوێت!

### ٨ – خۆشەویستی خاك و نیشتمان و گەل و نەتەوە:

مرۆڤی موسڵمان دەبێت بونەوەرو سروشتی بەگشتی خۆشبوێت، بەحوکمی سروشتی خۆشی مرۆڤ خاكو نیشتمانو شوێنی لە دایك بوونو گەورەبوونو وڵاتو نەتەوەی خۆی خۆشدەوێت. ئیسلامیش ڕێ لەو خۆشەویستیە ناگرێتو بەیەكێك لە خۆشەویستییە سروشتییەكانی دادەنێت بە مەرجێك رقمان لە وڵاتو خاكو نیشتمانو گەلانی دیكە نەبێت. ئەوەتا دەبینین پێغەمبەر (د.خ) كاتێك بە ناچاری لە شاری مەككە كۆچی كرد لەكاتی كۆچەكەیدا ئاوڕی بەلای شارەكەیدا دایەوەو فەرمووی:((ئەی مەككە تۆ خۆشەویسترین پارچە زەوی خودای لە لای من، سوێند بەخودا ئەگەر خەڵكەكەت ناچاریان نەكردمایە هەرگیز بەجێم نەدەهێشتیت)).

نیشانەی خۆشەویستی خاكو گەلو نیشتمانیش ئەوەیە هەوڵ بۆ پێشكەوتنو سەرخستنیان بدەینو لە كاتێكدا دەستدرێژیان دەكرێتە سەر بەرگریان لێ بكەین.

### ٩ – خۆشەویستی برایانە (مرۆڤەكانی دیكە):

خۆشەویستی برایانە ئەو جۆرەیە لە خۆشەویشتی كە ئاینە ئاسمانیەكانو لەوانەش ئیسلام جەختی زۆری لەسەر دەكاتەوە. خۆشەویستی برایانە هەموو جۆرەكانی دیكەی خۆشەویستی لە خۆ دەگرێت.

مەبەست لەم جۆرە خۆشەویستییەش بریتییە لە هەست بە لێپرسراوێتیو ئاگا لێبوونو رێز لێگرتنو پێزانین بەرامبەر مرۆڤەكانی دیكە، هەوڵدان بۆ بەختەوەركردنیانو، باشتركردنو خۆشتركردنی ژیانیان، بناغەی ئەم جۆرە خۆشەویستییەش برایەتی مرۆڤایەتییە هەروەك چۆن پێشەوا (عەلی كوڕی ئەبو تالب) فەرموویەتی: ((**مرۆڤەكان دوو دەستەن، یان لە ئایندا بران یاخود لە مرۆڤایەتیدا هاوتان**))، ئەم جۆرە خۆشەویستییە بە گوێرەی رێنماییەكانی ئیسلام جیاوازی لە نێوان مرۆڤەكاندا ناكاتو گوێ نادات بەوەی سەر بەهەر نەتەوەو ئاینو رەنگو رەگەزێك بن، هەر بۆیە یەكێك لە بەرهەمەكانی ئەم جۆرە خۆشەویستییە لێبوردەییە بەرامبەر مرۆڤەكانی دیكەو وا لە مرۆڤ دەكات دەمارگیرو دوژمنكارنەبێتو واز لە رقو كینە بهێنێتو بەمیهرەبانیو سینە فراوانییەوە مامەڵە لەگەڵ هاو رگەزەكانی خۆی بكات.

چونكە مرۆڤەكان هەرچی بن لە بنەڕەتدا ئەوانیش وەك ئەم مرۆڤنو خودای گەورە كەرامەتی پێ بەخشیوونو بەهەناسەو گیانی خودا زیندونو هەموویان خاوەنی یەك

پەروەردگارن‌و لەیەك سەرچاوەوە هاتوون‌و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە، مەگەر دوژمنانی خوداو مرۆڤایەتی بن، ئەوانیش مامەڵەی تایبەتیان لە گەڵدا دەکرێت.

هەر بۆیە ئێمە کاتێك هەموو مرۆڤەکانمان خۆشدەوێت بە نا راستەوخۆ خودای گەورەمان خۆش دەوێت چونکە مرۆڤەکان هەموویان بەدیهێنراوی ئەون‌و لەیەك دایك‌و باوك خستونیەوەو هەر ئەوەیش فەرمانی پێ داوین بە رێزو خۆشەویستییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین‌و هاوسۆزی خەم‌و ئازارەکانیان بین.

## گفتوگۆ:

خۆشەویستی چ رۆڵێك لە خۆشکردنی ژیانی خەڵك‌و کەم کردنەوەی کێشەکاندا دەگێڕێت؟

## پرسیار:

١ – ئەو شتانە چین کە خۆشەویستی خودای گەورە بۆ ئێمە زیاتر دەکەن؟

٢– بە خۆشەویستییەوە مامەڵە کردن لەگەڵ موسڵمانان‌و هاوڵاتیانی دیکەدا چ سودێکی ئەم دونیاو پاداشتێکی ئەو دونیای بەدواوەیە؟

٣– پەیوەندی خۆشەویستی‌و چوونە بەهەشت چیە؟

## وانەی بیست و چوارەم:

### دووەم - لێبوردەیی:

**لێبوردەیی**: واتە مامەڵە کردن بە میهرەبانی لەگەڵ بەرامبەرەکانو ڕێزگرتن لە مافو ئازادیو جیاوازییەکانو دوور کەوتنەوە لە رقو کینەو توندوتیژیو رەتکردنەوەی بەرامبەرەکانو دان نەنان بە مافو ئازادییەکانیاندا.

پێغەمبەری خودا **(د خ)** دەفەرموێت:((**بعثت بالحنيفية السمحة**)) واتە:(من بە لێبوردەییەکی پاك نێردراوم)، لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئیسلام ئاینی لێبوردەییە، لەئیسلامدا لێبوردەیی بەهایەکی گەورەی هەیەو هەڵقولاوی مانای فراوانی سنگ فراوانیو کرانەوەو داننانە بە بوونی بەرامبەرەکاندا لە روی ئازادیو یەکسانیو بڕوابوون بە چەسپاندنی مافەکانی هاوولاتیو جیاوازی نەکردن لەنێوان هیچ کەسێکدا بە بیانوی رەگەز یان ئاینو نەتەوە، ئاینی پیرۆزی ئیسلام بڕوای بە هەموو ئاینەکان هەیەو خودای گەورە دەفەرموێت:(( آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ))(البقرة ٢٨٥).

دیارە لێبوردەیی مانای بێ لایەنیو واز هێنان نیە لە ئاینو بیروباوەڕی خۆت، بەڵکو دان نانە بەوانی دیکەدا، کە دەبێت هەموو مافەکانیان هەبێتو ئازادیان پێ بدەیت هەر وەك ئیسلامیش ڕێنوێنی کردوین بۆ ئەم کارە.

دیارە ئیسلام بڕوای بە پێکەوە ژیانی هەموو نەتەوەو ئاینەکانو رەگەزەکان هەیەو دان بە بوونی هەموو ئەوانی دیکەدا دەنێت، لەهەمان کاتدا مامەڵەشیان لەگەڵ دەکاتو بڕوای بە پێکەوە ژیانو ژیانێکی مرۆییانە هەیە لەگەڵیاندا، پێغەمبەری خودا دەفەرموێت:((**الدين المعاملة**)) واتە: ئاین مامەڵەیە.

**لەفەرموودەیەکی دیکەدا کە عوبادەی کوڕی صامت دەگێڕتەوە لەپێغەمبەری خودایان پرسی (چ کارێك زۆر چاکە) فەرمووی: باوەڕ هێنان بەخوداو تێکۆشان لەپێناو خودادا. عوبادە ووتی ئەی پێغەمبەری خودا شتێکی ئاسانترم پێ بڵێ، ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: (لێبوردەییو سینگ فراوانیو ئارام گرتن).**

### جۆرەکانی لێبوردەیی:

لێبوردەیی چەندین جۆری هەیە لەوانەش:

١ - **لێبوردەیی ئاینی**: واتە پێکەوە ژیانی ئاینەکان، ئەویش لە ڕێگەی ئازاد بوونی خاوەن ئاینە جیاوازەکان لەجێبەجێکردنی ڕێوڕەسمە ئاینیەکانیانو مامەڵەکردنیان بە چاکەو داد پەروەری بەو جۆرەی خودای گەورە لە قورئاندا باسی کردووە:((لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ

يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)) (الممتحنة ٨) ، موسلّمان دەبێت باوەڕی بە هەموو ئەو کتێبانە بێت کە لەلایەن خوداوە بۆ پێغەمبەرەکان هاتوون، چونکە ئەمانە هەموویان کۆمەڵە وتەیەکی خودان لەئاسمانەوە هاتوون بۆ پێغەمبەرەکان، ئەو کتێبانەش چوار دانەن (قورئان، تەورات، زەبور، ئینجیل) جگە لەمانەش دەبێت هەموو خاوەن ئاینەکانی دیکە ماف و ئازادیان پارێزراو بێت.

قورئانیش داوا لەموسڵمانان دەکات به جوانترین شێوە مامەڵە لەگەڵ بەرامبەرەکاندا بکەن و بۆ بڕوا پێ هێنانیان پشت بە گفتوگۆ ببەستن، وەك دەفەرموێت:(( ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ))(النحل١٢٥). **واتە:** بانگەواز بکەن بۆ ڕێگەی خودا بە ژیری و ئامۆژگاری باش و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن بە باشترین شێوە.

هەروەها ئیسلام لەڕێگەی بڕوا بوون بە ئازادییەوە مامەڵە لەگەڵ بەرامبەرەکاندا دەکات و هەموو کەس ئازادە لەوەرگرتنی ئایندا و نابێت کەس زۆری لێبکرێت، چونکە ئاین بۆ دوا ڕۆژەو هەر کەسێك بە ئازادی وەری نەگرتبێت لەدوا ڕۆژدا سوودێکی لێ نابینێت، وەك خودای گەورە دەفەرموێت:((لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ))(البقرة٢٥٦).واتە: زۆر کردن لەئایندا نیە.

عومەری کوڕی خەتتابیش لەکاتێکدا کە (بيت المقدس)ی ڕزگار کرد لەدەستی مەسیحیەکان تەواوی ئازادی دا بە دانیشتوانەکەی و بەڵێنی پاراستنی پێدان و بە هاوەڵەکانی وت:(کە نەچنە ماڵەکانیان و دەریان نەکەن و ماڵەکانیان نەڕوخێنن، هیچ شتێك لەماڵ و داراییان نەبەن، نابێت زۆریان لێبکەن کە واز لەئاینەکەیان بهێنن).

٢ – **لێبوردەیی فیکری:** واتە گوێ گرتن بۆ بەرامبەرەکان و پشت بەستن بە پەیڤین و گفتوگۆ بۆ تێگەیشتن لەیەکدی و قبوڵ کردنی بیروڕای جیاواز، مێژوو گەواهی دەدات کە ئیسلام بە بۆچوونێکی مرۆییانە مامەڵەی لەگەڵ بیرە جیاوازەکاندا کردوە، ئیسلام باوەڕی بە ئیجتهاد هەیە ئەوەش ئەوە دەگەێنێت کە باوەڕی بە بۆچوونی جیاوازیش هەیە، مێژووی ئیسلام سەرهەڵدانی دەیان ئاینزاو ڕێچکەو ڕێبازی فیقهی و بیرمەندی و فەلسەفی بە خۆیەوە بینیوە، تەنانەت بێ باوەڕەکان و شوێنکەوتوانی ئاینەکانی دیکە، لە مزگەوتەکاندا مشت و مڕی فیکریان لە گەڵ یەکتردا کردووە.

٣ – **لێبوردەیی نەتەوەیی:** واتە نەتەوەکان لە نێو خۆیاندا ڕێز لە ماف و سەروەری یەکتر بگرن و هیچ نەتەوەو نەتەوەخوازێك بەرامبەر نەتەوەیەکی دیکە دەمارگیرو ڕەگەزپەرست نەبێت و بەچاوی سوك و نزم سەیری نەکات و دەستدرێژی نەکاتە سەر وڵات و مافەکانی وەك نەتەوەیەك. قورئان لەم ڕووەوە دەفەرموێت:(( يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)) (الحجرات ١٣). **واتە:** ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە دایك و باوکێك بەدیهێناوەو کردوومانن

بە کۆمەڵێك هۆزو گرووپی جیاواز بۆ ئەوەی یەکدی بناسن، بەڕێزترینتان لە لای خودای گەورە ئەوەتانە کە زۆرترین خواپەرستو چاکە خوازبێت.

لەم ئایەتەو چەندین ئایەتی دیکەدا بە روونی دان بە جیاوازیی نێوان گەلو نەتەوەکاندا نراوە، لە هەمانکاتدا بەگوێرەی ئەم ئایەتە ئەم جیاوازییە نابێت ببێتە هۆی سەرهەڵدانی دوژمنایەتیو رقو کینەو رەگەزپەرستی لە نێوان نەتەوەکاندا، بەڵکو دەبێت هەوڵی یەکدی ناسینو کرانەوە بەسەریەکدا بدەن، کۆتایی ئایەتەکەش ئەوە دەخاتە روو کە لای خودای گەورە هیچ نەتەوەیەك رێزی بەسەر نەتەوەیەکی دیکەدا نیە.

پێغەمبەریش (د.خ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرمووێت:((**لا فضل لعربي على أعجمي إلا بالتقوى**)).واتە:عەرەب رێزی بەسەر کەسی دیکەدا نیە، کەسیش رێزی بەسەر عەرەبدا نیە، سپی پێست رێزی بەسەر رەش پێستو رەش پێستیش رێزی بەسەر سپی پێستدا نیە، تەنها بە لەخودا ترسان و کاری چاکە نەبێت.

## بنەماکانی لێبوردن لەئیسلامدا:

١ – لەئیسلامدا هەموو ئاینە ئاسمانیەکان یەك سەرچاوەیان هەیەو هەموویان لەلایەن خوداوە هاتوون، گەرچی لە رۆانگەی قورئانەوە هەندێکیان دواتر دەستکاری کراون، لەبەر ئەوە نابێت بەناوی ئاینەوە کەس دژایەتی کەس بکات یان سوکایەتی بەرامبەر بە یەکدی بکەن.

٢ – لەئیسلامدا هەموو پێغەمبەران برای یەکدین، دەبێت موسڵمان باوەڕی بە هەموو پێغەمبەران هەبێتو ئەگەر وانەبێت باوەڕی نابێت.

٣ – لەئیسلامدا ئاین بە ئازادی وەردەگیرێتو زۆر کردن لەئایندا نیە، بیروباوەڕی ئاینی پێویستە بە خۆشەویستیو لەدڵەوە وەربگیریتو رێز لەشوێن کەوتوانی هەموو ئاینەکانیش دەگیرێت لە چوارچێوەی ئیسلامدا.((لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ)) (البقرة ٢٥٦).((وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ ...))(الكهف ٢٩)، واتە: تۆ ئەو هەقو راستیە بڵێو رایبگەێنە کە لە خوداوە بۆت رەوانە کراوە. ئەو کاتە کێ دەیەوێت با باوەڕ بێنێتو هەر کەسیش نایەوێت با بێ باوەڕبێت.

٤ – ئیسلام داوا لە موسڵمانان دەکات کە بە چاوی مرۆیی بوونەوە سەیری بەرامبەرەکانیان بکەنو بە باشترین شێوە گفتوگۆیان لەگەڵیدا بکەنو بە رێزەوە بۆیان بڕوانن، رۆژێك تەرمێکیان بەلای پێغەمبەردا (د.خ) هێنا لە کاتێکدا ئەو دانیشتبوو، هەر کە تەرمەکە گەیشتە لای پێغەمبەر (د.خ) یەکسەر وەك رێزگرتن لێی لەبەری هەڵسا، یەکێك پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا ئەو پیاوەی مردووە جولەکەیە. پێغەمبەر (د.خ) لە وەڵامدا فەرمووی: مەگەر ئەویش مرۆڤ نیە، **واتە:** بەحوکمی ئەوەی مرۆڤەو خودای گەورە بەدیهێناوە دەبێت رێزی لێ بگیرێت.

٥ – لەئیسلامدا ئازادی ئاینە جیاوازەکان ڕێزی لێگیراوەو بۆیان هەیە بە ئازادی خۆیان شوێنی پەرستشی خۆیان دروست بکەنو پارێزگاری لە شوناسو فەرهەنگی ئاینی خۆیان بکەنو بۆ کەس نیە ئەم مافەیان لێ زەوت بکات، لەم بارەیەوە ریسایەك هەیە کە دەڵێت:(لێیان گەڕێن وەك ئەوەی دەیانەوێت خواپەرستی خۆیان بکەن بە گوێرەی ئاینەکەیان رەفتار بکەن).

٦ – لەئیسلامدا شوێنکەوتوانی ئاینەکانی دیکە دەبێت ڕێزیان لێ بگیرێتو بە دادپەروەری مامامەڵەیان لەگەڵدا بکرێتو هەموو چاکەیەکیان لەگەڵدا بکرێت، پێغەمبەر (د.خ) لەم رووەوە دەفەرموێت:((**أَلاَ مَنْ ظَلَمَ مُعَاهِدًا أَوْ انْتَقَصَهُ أَوْ كَلَّفَهُ فَوْقَ طَاقَتِهِ أَوْ أَخَذَ مِنْهُ شَيْئًا بِغَيْرِ طِيبِ نَفْسٍ فَأَنَا حَجِيجُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**)).واتە:هەر کەسێك ئازاری شوێنکەوتوی ئاینەکانی دیکە بدات من لە رۆژی دوایدا دەبم بە داواکار لەسەری، هەروەها دەفەرمووێت:((**من آذى ذمياً**))،واتە:هەرکەسێك ئازاری شوێنکەوتوی ئاینەکانی دیکە بدات من رقە کاری ئەوم.

٧ – لە ئیسلامدا نابێت دژایەتی لەنێوان موسڵمانو شوێنکەوتوی ئاینەکانی دیکە لەسەر جیاوازی ئاینی دروست بێت چونکە هەموویان لە مرۆڤایەتیدا برای یەکدینو دەبێت مامەڵە لەگەڵ یەکدیدا بکەنو ڕێزی یەکدی بگرنو مافەکانی یەکدی پێشێل نەکەن خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەمووێت:((لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)) (الممتحنة ٨).واتە:خودای گەورە ڕێگریتان لێ ناکات لە گەڵ ئەوانەی لە سەر ئاین شەڕیان لە گەڵ نەکردونو لە ماڵو حاڵو نیشتیمانی خۆتان وەدەریان نەناون بە چاکەو میهرەبانی بجوڵێنەوەو رەفتار بکەن، چونکە خودای گەورە داد پەروەرانی خۆش دەوێت.

**گفتوگۆ:** چۆن دەتوانین خۆمان لەسەر لێبوردەیی رابهێنین؟

**پرسیار:** دەمارگیریو هەستی دوژمنایەتی کە پێچەوانەی لێبوردەیین زیان بە مرۆڤو کۆمەڵگە دەگەیەنن؟

## وانەی بیست و پێنجەم:

# خـێزان

**خێزان:** بریتیە لە گرنگترین دەزگای پەروەردەییو کۆمەڵایەتیو بناغەی پێکهێنانی کۆمەڵگە، کە لە دایبابو منداڵو نەوەکانیان پێك دێتو لانکەی خۆشەویستیو ڕێزو پێگەیشتنو میهرەبانییەو، ئەندامەکانی خاوەنی کۆمەڵێك مافو ئەرکن بەرامبەر بە یەکدی. مرۆڤ بەسروشتی خۆی حەزدەکات لەگەڵ کەسانی دیکەدا بژیو تەنها نەبێت، دروستکردنی خێزانو ژیان لەناویشیدا ئەم خواستەی بەدی دێنێتو لە تەنیاییو گۆشەگیری ڕزگاری دەکاتو ئاسوودەیی پێ دەبەخشێت.

### ١ - پێکهێنانی خێزان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە:

بێ گومان خێزان ڕۆڵێکی گەورەی لە ژیانی تاكو کۆمەڵگەدا هەیە، خودای گەورە لە خێزاندا وای لە ژنو مێرد کردووە کە هەریەکەیان ڕۆڵی تەواوکاری بۆ ئەوی دیکەیان هەبێت. هیچیان بەبێ ئەوی دیکە ئارامی نییەو یەکدی تەواو دەکەن، تاکەکان بەکورو کچەوە هەتا خێزان پێك نەهێنن هەست بە ئارامییەکی هەمیشەیی ناکەن، بەتایبەتیش گەر لەدروستکردنی خێزانێکی بەختەوەردا سەرکەوتوو بوون، هەر بۆیە ئیسلامیش بەچاوێکی پڕ بایەخەوە سەیری خێزان دەکاتو دەیەوێت لەسەر بناغەیەکی ڕاستو پتەو بنیاتی بنێتو، ئەركو مافی ئەندامەکانی بەجوانی دیاری بکات، هەروەها بەم جۆرەش پارێزگاری لێ دەکاتو بەهاکانی دەپارێزێتو گەشەیان پێ دەدات، لە سەر ئەم بناغەیە ئیسلام هانی دروستکردنی خێزانو هاوسەرگیری دەدات.

پێغەمبەر (د.خ) لەم بارەیەوە دەفەرموێت:((**النِّكاحُ من سُنَّتي، فَمَنْ لَمْ يَعْمَلْ بِسُنَّتي فَلَيْسَ مِنِّي**))،**واتە:** ژنهێنانو شوکردنو هاوسەرگیری لە سوننەتو ڕێبازی منەو هەرکەسێك کار بە سوننەتو ڕێبازی من نەکات لە من نیە.

هەروەها پێغەمبەر (د خ) روو بە گەنجان دەفەرموێت:((**ئەی گەنجان، هەرکەسێك لە ئێوە دەتوانێت با ژن بێنێت، چونکە چاوو داوێنی مرۆڤ دەپارێزێت، ئەوانەشتان ناتوانن با بە رۆژبن، یاخود خۆتان بگرن تا وەکو دەرفەتی ژنهێنانو شوکردنتان بۆ دەرەخسێت**)).

خودای گەورە غەریزەی جنسی لە هەردوو رەگەزەکدا دروستکردووەو هەست دەکەن پێویستیان بە یەکدییەو یەکدی تەواو دەکەن، ئیسلام وەکو هەندێك (ئاین) داوا لە مرۆڤ ناکات واز لە ژیانی دونیاو خۆشییەکانیو لەوانەش خۆشی (جنسی)بێنێت، بەڵکو تەنها داوای لێ دەکات ئەم غەریزەو غەریزەکانی دیکە، لە چوارچێوەی رەوشتو بەها کۆمەڵایەتیە بەرزەکانو ئامانجە راستەکانداو بە پێی شەریعەتی ئیسلام تێربکرێت.

هاوسەرگیریو پێکهێنانی خێزانیش ئەو چوارچێوە شەرعیو یاساییو ئەخلاقیەیە ئەم ئامانجە لەپاڵ کۆمەڵێك ئامانجی دیکەدا بەدی دێنێتو، مرۆڤ لەلادانو تاوان دوردەخاتەوەو، وای لێ دەکات چێژ لە ژیان وەربگرێتو خودای گەورەش لەخۆی رازی بکات. هەروەها لە کۆمەڵگەشدا بەسەر بەرزی بژیو ناوو ناوبانگی خۆیو بنەماڵەکەی بپارێزێت.

## ٢ - هەڵبژاردنی هاوسەر:

هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان مەسەلەیەکی یەکجار گرنگەو دوارۆژی خێزانی پێوە بەندە. خێزانیش بۆ ئەوەی ئەو دەورەی لێی چاوەڕوان دەکرێت بیگێڕێت، وە لەسەر بناغەیەکی پتەوو راست دابمەزرێنرێت، دەبێت هەر لە یەکەم هەنگاوی پێکهێنانیەوە حیسابی وردی بۆ بکرێتو نەخشەی بۆ دابڕێژرێت، چونکە ئەگەر شتێك لە سەرەتاوە بە راستو دروستی دەستی پێ نەکرد، دواتر وزەو توانایەکی زۆر بۆ راستکردنەوەی پێویستە.

یەکەم هەنگاوی خێزانیش دیاریکردنی هاوسەری دوارۆژە، هەر بۆیە ئیسلام جەختی زۆری لێ دەکاتو داوامان لێدەکات لەم رووەوە هۆشیاربینو بڕیاری راست بدەینو بەڕوکەش فریونەخۆین، دیارە ئەو بناغەو پێوەرانەش کە مرۆڤ هاوسەری ژیانی خۆی بەگوێرەی ئەوان هەڵدەبژێرێت دیسانەوە مەسەلەیەکی گرنگە، ئیسلامیش لەم رووەوە رێنوێنی پێویستی کردووینو چەندین پێوەرمان دەداتە دەست بۆ ئەوەی بەهەڵەدا نەچینو لەسەر بناغەیەکی راستو دروست هاوژیانی خۆمان هەڵبژێرینو نەخشە بۆ ژیانێکی خێزانیی بەختەوەرو کامەران دابڕێژین.

## بناغەو پێوەرەكانی هەڵبژاردنی هاوسەر لە ڕوانگەی ئیسلامەوە:

### ‌ذ – ڕەچاو كردنی ئاین:

ئیسلام زۆر گرنگی بەوە دەدات خێزان لەسەر بنەمایەكی پتەو دابمەزرێت، چونكە ئەگەر بنەماكەی بەهێز نەبێت ناتوانێت لەبەردەم ڕەشەبای كێشەو گرفتەكانو هەڕەشە دەرەكییەكاندا بووەستێتو خۆی بگرێتو ئەندامەكانی بپارێزێت، هەر لەبەر ئەوەشە (ئاین) دەكاتە بنەمایەكی بەهێز لە دروستكردنو پێكهێنانیداو، پەیمانی هاوسەریش لە نێوان ژنو پیاودا بەپیرۆز دەزانێت.

ڕەچاوكردنی بەهاو بنەماكانی ئیسلام لە ژیانی خێزانیدا هاوسەرەكان دوردەخاتەوە لە خیانەت كردن لە یەكدیو هانیاندەدات پێكەوە هاوكاربن بۆ گوزەراندنی ژیانێكی خۆشو پەروەردەكردنێكی جوانی منداڵەكانیانو پاراستنی ئارامی خێزانەكانیان.

پێغەمبەر (د خ) لەم ڕووەوە دەفەرموێت:((**تنكح المرأة لأربع، لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينها، فاظفر بذات الدين تربت يداك**))، **واتە:** پیاو لەبەر یەكێك لەم چوار شتانە ئافرەت دەكات بە هاوسەری خۆی، لەبەر دەوڵەمەندی و ماڵەكەی، یاخود بنەماڵەكەی، یان جوانییەكەی، چوارەمیش ئاینداری .. تۆ ئایندارەكە هەڵبژێرە براوەی.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت پیاو ژن نەهێنێت ئەگەر دەوڵەمەند بێت یاخود خاوەنی بنەماڵەو جوان بێت. بەڵكو مەبەست لەوەیە مادام یەكێك خۆی بە موسڵمان دەزانێت دەبێت هەمیشە یەكێك لە پێوەرە گرنگەكانی ئاینی هاوسەرەكەی بێت، چونكە وەك وتمان ڕەچاوكردنی بەها ئیسلامیەكانو پابەندبوونی هاوسەرەكانو ئەندامانی خێزان بە ئەركە موسڵمانێتێیەكانی سەرشانیان، خێزان بە هێزو پتەو دەكاتو كێشەو گرفتە خێزانییەكان كەم دەكاتەوەو یارمەتی دەرێكی باش دەبێت بۆ هێنانەدی كەشو هەوایەكی خێزانی كامەرانو پڕ لە هەستی ناسكو گەرمو گوڕ.

### ب – ڕەوشت جوانی:

پێوەرێكی دیكەی هەڵبژاردنی هاوسەر، بوونی ڕەوشتی جوانە لە دیاریكردنی هاوسەری دواڕۆژدا، ڕەچاوكردنی ڕەوشت جوانی لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیاندا بۆ كچو كوڕ یەكجار گرنگە بەتایبەتیش ڕەچاوكردنی لە پیاودا، چونكە ئەوەی حوكمی خێزان دەكاتو دەیكات بە شوێنی پەروەردەی جوانو حەوانەوەوە، یاخود ئاژاوەو

ناخۆشی، بوون یاخود نەبوونی ڕەوشتە لە هاوسەرو ئەندامەکانیدا، پێغەمبەر (د.خ) لەم بارەیەوە لە فەرموودەیەکدا ئامۆژگاری خێزانەکان دەکاتو دەفەرمووێت: ((**اذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه، الا تفعلوه تكن فتنة في الارض وفساد كبير**)).

(**ترمذي وحاكم**) ڕیوایەتیان کردووە.

**واتە:** ئەگەر یەکێك هات بۆ داوای کچەکەتان لە ڕەوشت و ئاینی ڕازی بوون بیدەنێ (هەڵبەت دوای ڕازی بوونی کچەکە خۆی) چونکە گەر وانەکەن ئەوە خراپەو ئاژاوە لە زەویدا بڵاو دەبێتەوە. کەواتە مرۆڤ پێش ئەوەی سەیری دەوڵەمەندیو جوانیو ناسراویو بڕوانامەو ئەم شتانە بکات، بۆ ئەوەی یەکێك بەهاوسەری خۆی یاخود هاوسەری کچو کوڕو خوشكو براکەی دیاری بکات، دەبێت سەیری ڕەوشتی بەرامبەر بکاتو لێی بکۆڵێتەوە. چونکە ئەگەر مرۆڤێك هەموو شتەکانی دیکەی هەبێت بەڵام کەمو کورتی ڕەوشتی هەبوو بەمانا فراوانەکەی ڕەوشت، ئەوا ناتوانێت ببێتە هاسەرو باوك یاخود دایکێکی باشو، جۆرەها کێشە بۆ هاوبەشی ژیانو خێزانەکەی دروست دەکات.

لەلایەکی ترەوە ئەوەی لەم فەرموودەیەدا گرنگە ئەوەیە کە تەنها ئاینداری تەنها ڕواڵەت نیە بۆ ڕازی بوون بەیەکێك بۆ ئەوەی بەهاوسەر دیاری بکرێت، بەڵکو لە پاڵ ئەودا ڕەوشتیش گرنگە مەرجیش نیە یەکێك بە ڕواڵەت موسڵمان بوو خودا پەرستیشی دەکرد، ڕەوشتی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا جوانو ناسك بێت، پیاوێك هەرچەندە موسڵمانیش بێت بەڵام موسڵمانیەتەکەی کاری نەکردبێتە سەر ڕەوشتیو دڵ پیسو ڕەزیلو هەست بریندارکەرو توڕەو زمان پیس وتەمبەڵ بێت بە کەڵکی ئەوە نایەت بکرێت بەهاوسەری ژیان.

پ – ئازادی لە هەڵبژاردندا:

لەبەر ئەوەی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە دەبێت خێزان لەسەر بناغەی سۆزو خۆشەویستی دابمەزرێنرێت، نابێت زۆر لە هیچ یەك لە دووهاوسەرەکەو بەتایبەتیش کچ بکرێت لە دیاریکردنی هاوسەردا، زۆرلێکردن لە بەشودانو ژنهێناندا نەریتێکی نەزانانەو دواکەوتوو خێڵەکیی پێش ئیسلامەو دەبێت کۆتایی پێ بێتو ئیسلام ڕەتی دەکاتەوە، گرێبەستی هاوسەرگیری لەشەریعەتی ئیسلامدا گرێبەستێکە لەسەر بناغەی ڕەزامەندی هەردوو لا دروست دەبێت، هەر بەو ڕەزامەندییەش دادەمەزرێت، ئەگەر لایەکیان زۆری لێ بکرێت بەوە گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە دانامەزرێتو بەتاڵ دەبێتەوە.

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموویێت:((لا تُزوَّج الثيب حتى تُستامر ولا تزوَّج البكر حتى تُستأذَنَ)) موسلیمو بوخاری ڕیوایەتیان کردووە.

**واتە:** بێ ڕازی بوونو ڕێ پێدانی خۆی کچ مارە ناکرێتو بەشو نادرێت، هەرچی دەربارەی شوکردنی بێوەژنە مەسەلە توندترەو دەبێت بێوەژنەکە خۆی بڕیار بدات و دەری ببڕێت کە ڕازییە شو بە کەسێکی دیاریکراو بکات.

لە فەرموودەیەکیشدا هاتووە کە:((لا تكرهوا البنات فإنهن المؤنسات الغاليات))، **واتە:** زۆر لە کچان مەکەن چونکە خەمڕەوێنو هاو دەنگو قەدرگرانن ، ئەبو داوود گێڕاویەتەوە کە (ئیبن عەباس) دەگێڕێتەوە کچێکی گەنج هاتە لای پێغەمبەرو باسی ئەوەی بۆ کرد کە باوکی بەشوی داوەو، ئەمیش ڕازی نیەو حەزناکات شو بەو کەسە بکات کە باوکی بۆی دیاریکردووە، پێغەمبەر (د.خ) سەرپشکی کرد لەوەی گرێبەستەکە هەڵبوەشێنێتەوە یاخود ڕازی بێت.

ئەبو هورەیرەش دەگێڕێتەوە کە کچێك هات بۆ لای پێغەمبەر (د.خ) و پێی وت: باوکم داومی بە برازاکەی بۆ ئەوەی شانو شەوکەتی خۆی بەرزبکاتەوە، بەبێ ڕەزامەندی من. پێغەمبەر (د.خ) چارەنووسی خۆی دایەوە دەست خۆیو فەرمووی بڕیار هی خۆتەو دەتوانیت هەڵیبوەشێنیتەوە، کچەکە ووتی: من ڕێم بە باوکم داوە بەوەی کردویەتی، بەلاّم بەمە ویستم ئافرەتان بزانن کە باوکەکان ناتوانن بێ ڕەزامەندی ئەوان بیاندەن بەشوو زۆریان لێ بکەن.

دایكو باوکان لەم ڕووەوە دەبێت لەم مەسەلە هەستیارەدا بە دڵسۆزیەوە مامەڵە بکەنو ئازادی بە کوڕو کچەکانیان بدەن، بەلاّم لە هەمانکاتدا ڕێنماییان بکەن بۆ باشترین شێوازی هەڵبژاردنی هاوسەر، بۆ ئەوەی لەسەر بناغەیەکی رووکەشو سادەو ساکارو لەژێر کاریگەری سۆزێکی گەنجانەی روتدا، هاوسەری ژیانیان دیاری نەکەن، چونکە خێزان دروستکردن بەرپرسیارێتییەو دەبێت لە رووی کۆمەلایەتیو دەروونیو فسیۆلۆجییەوە دامەزراو بێتو ببێتە لانەی بەختەوەریو پەروەردەی باش بۆ ئەوەی کۆمەڵگەش بەهێزو چالاكو گەشەکردو بێت، کوڕو کچەکانیش پێویستە ڕاوێژ بە دایكو باوکیان بکەنو سوود لە ئامۆژگاریو شارەزایی ئەوان وەربگرن.

ت - سەیرکردنو ناسینو لە یەکدی تێگەیشتن:

ئەو دوو کەسەی دەخوازن ببن بە هاوسەری یەکدی دەبێت یەکدی ببیننو لە رووی ڕواڵەتو مەسەلەکانی دیکەوە یەکدیان بەدڵ بێت، ئینجا هەوڵی هاوسەرگیری بدەنو هەنگاوی بۆ بهاوێن.

رۆژێــك یــەكێك لــە هــاوەڵانی پێغەمبــەر (د.خ) خــوازبێنی كچــێكی كردبــوو پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سەیری ئافرەتەكەت كردووەو بەدڵت بووە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دەبڕۆ سەیری بكە چونكە ئەمە پێویستە بۆ ئەوەی پەیوەندی هاوسەریتان لەگەڵ یەكدا بەردەوام بێت، ناسینو قسە لەگەڵ یەكدی كردنو ئاڵو گۆڕكردنی بیرو ڕا لەگــەڵ یەكــدی، هــەموو ئەمانــە مــادام مەبەســت تیایانــدا هاوســەرگیری بێــتو لــە چوارچــێوەی پێــوەرو رەوشــتە ئیســلامیەكان دەرنەچــێت، خزمــەت بــە پرۆســەی هاوسـەرگیری دەكـەن بـۆ ئـەوەی  پێكهێنـانی خێـزان لەسـەر بناغـەی رەزامەنـدیو لـە یەكدی تێگەیشتن بێتو، تەنها لەسەر بنەمایەكی روكەشو رواڵەتی بنیات نەنرێتو مەبەست تیایدا تەنها تێركردنی غەریزەی سیكسی نەبێت، بەڵكو بەدیهێنانی ژیانێكی ئارامو ئاسودەو پڕ خۆشەویستیو سۆزو هاوكاری بێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئیسلام پێش هەرشتێك ئافرەت وەك مرۆڤ سەیر دەكات نابێت لە مەسەلەی جوانی ئەودا زیادە ڕەوی بكرێتو هەموو شتێكی لە جوانییەكەیدا كورتبكرێتەوە.

### ج – هاوشان بوون:

واتە دووهاوسەرەكە لە هەندێك رووەوە لە یەكدی نزیك بنو هەندێك جیاوازی نەبێتە مایەی ناكۆكییە خێزانییەكانو كەمكردنەوەی هەست كردن بە سۆزو كامەرانی نێوانیان، روونیشە كە لە ئیسلامدا چینایەتی نیەو مرۆڤەكان لەبەردەم خوداو یاسای ئیسلامدا یەكسانن، بەڵام لە هەمانكاتدا رەچاوكردنی هاوكوفی بەگوێرەی كاتو سەردەمو شوێنە جیاوازەكان بۆ پێكهێنانی خێزان گرنگە، هاوكوفیش زیاتر پیاو دەگرێتەوە نەك ئافرەت.

واتە هەموو ئافرەتێك هەر ئاستێكی هەبێت هاوكوفی هەموو پیاوێكە با بەرزترین پلەوپایەشی هەبێت، مەبەست لە رەچاوكردنی ئەم خاڵە ئەوەیە مرۆڤ بۆ ئەوەی خێزانێكی ئارام پێكبێنێت هەوڵبدات رەچاوی ئاستی كۆمەڵایەتیو رۆشنبیریو ئابوری بنەماڵەی بەرامبەر بكاتو جیاوازی نێوانیان یەكجار زۆر نەبێت، بۆ ئەوەی زۆرترین گونجان لە نێوان هەردوو لادا هەبێت.

## گفتوگۆ:

لاوازبوونی خێزان چ ڕەنگدانەوەیەکی خراپی بەسەر ژیانی ئەندامەکانیو کۆمەڵگەدا دەبێت؟

## پرسیار:

١- ئایە زۆر لێکردن لە کوڕان و کچان لە مەسەلەی ژنهێنانو شوکردن لەگەڵ ئیسلامدا گونجاوە؟

٢- دەبێت لەسەر چ بناغەیەك هاوسەری داهاتووی ژیانمان هەڵبژێرین؟

## وانەی بیست و شەشەم:

# گرنگی خێزان و ئەرکەکانی لە ئیسلامدا

هەروەك رون بۆوە ئیسلام بایەخێکی یەکجار گەورە بەخێزان دەدات هەر بۆیە لە یەکەم ساتی پێکهێنانیەوە رێنوینیی و راسپاردەی هەیە، تا دەگاتە پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی.

لە روانگەی ئیسلامەوە ئەو خێزانەی خودای گەورە بپەرستێت و پێوەرە ئیسلامیەکانی بەسەردا بچەسپێت، ئەندامەکانی کامەران دەبن، دەبێت چەندین ئەرك جێبەجێ بکات، بایەخ و ئەرکەکانی خێزانیش لە روانگەی ئیسلامەوە لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

**یەکەم - دابینکردنی ئارامی و ئاسوودەیی:** یەکەم ئەرکی خێزان لە روانگەی ئیسلامەوە ئەوەیە کە ببێتە شوێن و پەناگەیەك بۆ ئاسودەیی دەرونی دایباب و منداڵەکانیان، خودای گەورە دەفەرموێت:(( وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّن بُيُوتِكُمْ سَكَنًا))(النحل ٨٠)، **واتە:** خودای گەورە ماڵەکانتانی کردۆتە مایەی دڵئارامی و ئاسودەیی، ئەوەی ژیان و ئارامی و ئاشتی و ئاسودەیش بە ماڵ دەبەخشێت خێزانە.

خودای گەورە هەر وەك چۆن ماڵەکانی بۆ کردوین بە جێگەی حەوانەوە، ئاوەهاش پەیوەندی هاوسەریەتی کردووە بە مایەی ئارامی دڵ و ئاسودەیی دەرون و دەفەرموێت: (( وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا...))(الروم ٢١). **واتە:** لە نیشانەکانی خودای گەورە ئەوەیە کە مرۆڤی لە دوو رەگەز بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی لە رێی پێکهێنانی خێزان و بوون بە هاوسەری یەکدییەوە هەریەکەیان ببێتە سەرچاوەی ئارامی و بەختەوەری بۆ ئەوەی دیکە هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:(( هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ...))(الاعراف١٨٩).

**واتە:** خودای گەروە ئەو کەسەیە کە ئێوەی لەیەك نەفس (بنەڕەت) بەدیهێناوە هەر لە توخمی ئەویش هاوسەری بۆ پەیداکرد تا لە سایەیدا ئاسودەو ئارام بژی.

ئەم ئارامی و ئاسودەییەش بەوە دێتە دی ئەندامانی خێزان لە یەکدی دڵنیابن، وە هەموو ئەو شتانەی دەبنە مایەی ناکۆکی و رق و تورەیی وەلاوە بنێن و هەوڵی

بەدیهێنانی کەش‌و هەوایەکی پڕ لە خۆشی‌و ئارامی‌و بەختەوەری بۆ خێزانەکەیان بدەن.

لە روانگەی ئیسلامەوە ژن‌و پیاو یەکدی تەواو دەکەن، هیچیان بێ ئەوی دیکە ئارامی تەواوی دەست ناکەوێت، مرۆڤ تا خێزان پێکنەهێنێت هەست بە ناتەواوی‌و بۆشایی دەرونی‌و کۆمەڵایەتی دەکات بەهۆی ئەم پەیوەندییە باشەی نێوان ژن‌و مێردیش لە خێزاندا ماڵەکان دەگەشێنەوەو کۆمەڵگەش پێش دەکەوێت.

پەیوندی ژن‌و پیاو لە خێزاندا دەبێت بگاتە ئاستێك وەك ئەوەی گیانێك بن لە دوو جەستەدا هەست‌و ئامانج‌و خەمی هاوبەشیان هەبێت‌و هەریەکەیان رەچاوی حەزو بەختەوەری‌و کەسێتی و خۆشی ئەوی دیکە بکات:(( ...هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ...))(البقرة ١٨٧).

**واتە:** ژنەکانتان پۆشاکی ئێوەن‌و ئێوەش بۆ ئەوان پۆشاکن، پۆشاك مرۆڤ لە گەرماو سەرماو نەخۆشی دەپارێزێت‌و جوانی پێ دەبەخشێت، هاوسەرەکانیش دەبێت رۆڵی پۆشاك بۆ یەکدی ببینن‌و ببنە مایەی خۆشبەختی یەکدی‌و یەکدی جوان بکەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خێزان شوێنی ململانێ‌و مل پێ کەچ کردن‌و نواندنی هێزو دەسەڵات‌و خۆ هەڵکێشان‌و فەرامۆشکردن نیە، بەڵکو باوەشی رەوشت‌و وەفاو خۆشەویستییە.

**دووەم – دابینکردنی سۆزو بەزەیی:** ئەرکێکی دیکەی بنەڕەتی خێزان بریتییە لە دەستەبەرکردنی سۆزو خۆشەویستی بۆ ئەندامەکانی، ئەوەی دەبێتە هەوێنی ژیانێکی خێزانی کامەرانیش هەستکردنە بە گەرمی ئەو سۆزو خۆشەویستی‌و بەزەییەی کە خێزان بە مرۆڤی دەبەخشێت‌و، هیچ دەزگایەکی دیکەش ناتوانێت ئەو رۆڵە بەو جۆرە بگێڕێت، مرۆڤ کاتێك لە ژیاندا ماندوو دەبێت، پێویستی بە پشودان‌و حەسانەوەیە، بۆیە کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ ناو خێزان مافی خۆیەتی هەست بەخۆشەویستییەکی پاك‌و گیانێکی پڕ لە میهرەبانی بکات، دەبێت دایك‌و باوك‌و منداڵەکانیش بەسەریەکەوە هاوکاری یەکدی بکەن بۆ ئەوەی خێزانەکەیان پڕ بێت لە خۆشەویستی‌و هەستی ناسك‌و سۆزو بەزەیی خاوێن، **خودای گەورە لەم رووەوە دەفەرموێت**:(( ...وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ))(الروم ٢١).

**واتـە:** خـودای گـەورە سـۆزو بـەزەیی لـە نێوانتانـدا – لـە نێـوان ژنو پیـاودا وەك دوو هاوسـەر– دروسـت کـردووە، ئەمـەش بەڵگـەو نیشـانەن بـۆ ئەوانـەی بیردەکەنـەوە، لـە روانگـەی ئـەم ئایەتـەوە خێزانێـك بـە خێـزان دادەنرێـتو خـودای گـەورە لێـی رازییـەو لەسـەر بناغـەی ئیسـلام دامـەزراوە، کـە باوەشـی سـۆزو بـەزەییو خۆشەویسـتی بێت، ژنو پیـاوو سـەرجەم ئەنـدامانی خێـزان لەگـەڵ یەکدیـدا میهرەبـان بـنو یەکـدیان خۆشبوێتو دوربن لە توندوتیژی خێزانیو ئاژاوەو کێشەو ناکۆکی کە ئاسودەییو بەختەوەری خێزان تێکدەدات .

لە خێزانێکدا ئافرەت زوڵمی لێ بکرێتو توندوتیـژی لەگـەڵ ئـەوو منداڵـەکان لەلایـەن پیاوەوە بەکار بهێنرێت، یاخود پیاو بێ بەش بێت لەسۆزو هەستی پاكو ناسکی ژن، ئـەو خێزانـە لـە رێنوینییـەکانی ئیسـلام لای داوەو ژیـانی ئەندامـەکانی تـاڵ دەبێـتو سەرپێچـی فەرمانـەکانی خـودای گـەورەیان کـردووە، چـونکە هەرکەسـێك لـە هاوسـەرەکانو منداڵـەکان کارێـك بکـات ئاسـودەیی خێـزان تێکبـدات بـەم کـارەی دژی خواسـتو فـەرمانی پـەروەردگار وەسـتاوەتەوەو رێـزی لـە مـافی ئەنـدامانی دیکـەی خێزانەکەیشی نەگرتووە، چونکە خێزان دەبێت ئەندامەکانی ئەرکەکانی سەرشـانیان بەرامبەر یەکدی ئەنجام بدەنو رێز لە مافەکانی یەکدی بگرنو هەموویان هەست بە کەرامەتی خۆیان بکەن.

**سـێیەم – پـەروەردەکردنی منـداڵ:** مەبەسـت لـە دروسـتکردنی خێـزان خسـتنەوەی نەوەیـەکی چاکەکاری بـەرێزە بـۆ ئـەوەی تاکـەکان بـە ئـارامی بەیەکـەوە بـژینو رێـزی یەکدی بگرن هـەر بۆیـە یـەکێك لـە هـەرە ئەرکـە گرنگـەکانی دیکـەی خێـزان بریتییـە لـە پـەروەردەکردنی منـداڵ لەلایـەن دایـكو باوکـەوە، دیـارە یـەکێك لـە ئامانجـەکانی هاوسـەرگیری خسـتنەوەی نـەوەو بـەردەوام بـوونی ژیـانو رەگـەزی مرۆڤـە لـەم سـەر زەمینەدا، بەڵام ئەرکی دایكو باوك تـەنها نـەوە خسـتنەوەو بـەخێو کردنـی منداڵ نیـەو بەوە کۆتایی نایەت، بەڵکو هەموو ئەو شتانە بێ پـەروەردەکردنێکی راستو دروسـتی منـداڵ ئامانجـەکانیان نـاپێکن، لـە روانگـەی ئیسـلامەوە خێـزان دەبێـت ببێتـە قوتابخانەیەك بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی باوەڕدارو هۆشیارو چاکەخواز، قورئان فێـری دایـكو باوکـان دەکـات کـە منداڵـەکانیان بـەجۆرێك پـەروەردە بکـەن بەرچـاویان روون بکەنـەوەو ببنـە پێشـەنگ لـە خواناسـیو چاکەکاریو خزمـەتکردن بـە کۆمـەڵ، هـەروەك

دەفەرمویّت:(( وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْـيُنٍ وَاجْعَلْنَـا لِلْمُتَّقِـينَ إِمَامًا))(الفرقان ٧٤).

**واتە:** ئەوانەی کە نزا دەکەن‌و دەڵێن خوایە گیان خێزان‌و منداڵێکمان پیّ بدە کە ببنە روناکی چاومان‌و بمانکە بە رابەرو پێشەوای پیاوچاکان.

کەواتە خێزان لە ئیسلامدا پێگەیەکی پیرۆزی هەیەو لە پێناو کۆمەڵێك ئامانجی بەرزو پیرۆزدا بنیاتنراوە، هەر بۆیە داوا لە موسڵمانانیش دەکات بە گرنگییەوە سەیری بکەن‌و لەم ریّشەیەوە خۆیان کامەران بن‌و خزمەت بە کۆمەڵگەکەشیان بکەن وە ریّ لە لاوازی‌و هەڵوەشانەوەی خێزان بگرن‌و رووبەرووی هەموو ئەو بانگەشە ناراستانە ببنەوە کە لە پلەو پایەی خێزان کەم دەکەنەوەو بیّ ریّزی بەرامبەر بەهاکانی دەکەن، یاخود داوای هەڵوەشاندنەوەی دەکەن، چونکە لاوازی‌و لەبەر یەك هەڵوەشانەوەی خێزانەکان جۆرەها نەخۆشی‌و گرفتی کۆمەڵایەتی بەدوای خۆیدا دەهێنێت لەوانەش:

١- پەرتەوازەبوونی منداڵ‌و تووشبوونی بە کۆمەڵێك دیاردەی ترسناکی وەك مادە بیّ هۆشکەرەکان‌و خواردنەوەو بەکارهێنانیان لەلایەن هەندێك باندی مافیاوە بۆکاری ترسناك‌و بەدرەوشتی.

٢- نەمانی خۆشەویستی راستەقینە لەنێوان ژن‌و پیاودا بەشێوەیەك کە بتوانن ژیانێکی درێژخایەن بەیەکەوە بژین.

٣- زۆربوونی نەخۆشی دەرونی‌و هەستکردن بە تەنیایی‌و ترس‌و دڵە راوکیّ.

٤- لاواز بوونی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوەش گیانی هاوکاری کەم دەکاتەوەو وا لە تاکەکان دەکەن هەست بەتەنیایی بکەن‌و نەتوانن بەگوێرەی پێویست چێژ لە ژیان وەربگرن.

بۆ ئەوەی ریّ لەمە بگرین‌و خێزانەکانمان ببنە شوێنێك بۆ پەروەردەو حەسانەوەو گەشەپێدانی عەقڵ‌و فیکرو سۆزو خۆشەویستی پێویستە رەچاوی هەموو ئەو شتانە بکرێت کە لەمەوپێش باسکران.

ئەرکی لاوانیش لەم نێوەندەدا گرنگەو دەبێت بەو جۆرە رەفتاربکەن کە لەگەڵ ئامانجەکانی خێزانێکی موسڵمان‌و هاوچەرخدا گونجاو بێت. هەر کارو رەوشت‌و رەفتارێك ببێتە هۆی تێکدانی کەش‌و هەوای ئارامی خێزان، یاخود ناوو ناوبانگی بنەماڵەکەیان لەکەدار بکات، پێویستە لێی دوربکەونەو بۆ ئەوەی هاوکاری دایك‌و باوك‌و خێزانەکانیان بکەن‌و هەوڵبدەن خێزانەکانیان ببن بە خێزانی نموونەیی، خێزانی نموونەیش بەو خێزانە دەوترێت کە شەرو ئاژاوەو کێشەی تێدا نیەو ئارامی‌و خۆشەویستی باڵی بەسەردا کێشاوەو ئەندامەکانی لەگەڵ یەکدیدا کراوەو دەم بە پێکەنین‌و بەرێزن‌و بەزمانێکی جوان لەگەڵ یەکدیدا دەدەوێن، هەروەها ریّز لە راو بۆچوونی یەکدی دەگرن‌و یارمەتی یەکدی دەدەن.

## ئەرك‌و مافەكانی ئەندامانی خێزان لە روانگەی ئیسلامەوە

بۆ ئەوەی خێزان بەردەوام بێت‌و رۆڵی دەرونی‌و كۆمەڵایەتی‌و پەروەردەیی خۆی ببینێت، بەو جۆرەی كە لە پێشەوە باسكرا ئیسلام هەوڵی داوە ئەرك‌و مافی بۆ ئەندامەكانی دیاریبكات، خێزانیش لە روانگەی ئەوەی كە لەدایك‌و باوك‌و منداڵ پێكدێت.

دەبێت دیاریكردنی ئەو ئەرك‌و مافانە هەموویان بگرێتەوە، ئەركی موسڵمانانەو ئەخلاقیانەی هەر تاكێكی خێزانیشە، ئەركەكانی سەرشانی بەجوانی بەرامبەر ئەندامەكانی دیكەی خێزان‌و بنەماڵەكەی ئەنجام بدات‌و رێز لە مافەكانیان بگرێت‌و مافی خۆشیەتی لە مافەكانی خۆی بەهرەمەند بێت، بۆ جوانتر رونكردنەوەی ئەم ماف‌و ئەركانە هەوڵدەدەین بە كورتی ئاماژەیان پێ بكەین‌و بیخەینە بەردەم قوتابیانی خۆشەویست.

### یەكەم - مافەكانی ژن و پیاو بەرامبەر بە یەكدی:

لە ئیسلامدا ژن‌و پیاو چەندین مافیان بەسەر یەكدییەوە هەیەو هیچ كەسێكیان نابێت ئەو مافە شەرعی‌و یاساییەی بەرامبەرەكەی پێشێل بكات، چونكە رەچاو نەكردنی مافەكان دەبێتە هۆی تێكچوونی پەیوەندییەكان‌و كەمبوونەوەی ئارامی‌و خۆشەویستی لە خێزانەكاندا، مافی هەر هاوسەرێكیش بەسەر ئەوەی دیكەوە دەبێتە ئەركی ئەو بەرامبەر بە ئەم، لە ئیسلامدا هەردوو هاوسەر دەبێت بە خۆشەویستی‌و میهرەبانی‌و رێزەوە مامەڵە لە گەڵ یەكدی بكەن‌و لە زبری‌و توندو تیژی‌و رەچاونەكردنی مافەكانی یەكدی بە دور بن.

### گفتوگۆ:

لە روانگەی ئەو ئەركانەی خێزان كە باسكران هەندێك لە كێشەكانی ئێستای ئێمە باس بكە؟

## وانەی بیست و حەوتەم:

### دووەم- مافەکانی منداڵ لە خێزاندا

### مافی منداڵ بەسەر دایک و باوکەوە

**منداڵ لە ئیسلامدا لە ناوەو دەرەوەی خێزان چەندین مافی هەیە دایک و باوکانیش دەبێت ڕەچاوی ئەم مافانەی منداڵ بکەنء ژێر پێیان نەخەن**

**لە گرنگترین ئەو مافانەش ئەمانەی خوارەوەن:**

**١ - ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی هاتنە دونیایەوە:**

لە ئیسلامدا خێزانەکانو دایكو باوکان دەبێت بە ئاهەنگو خۆشییەوە پێشوازی لە هاتنە دونیای منداڵ بکەنو بە هێمای خێرو خۆشی بزانن.

لەمەشدا منداڵی کوڕو کچ جیاوازی نیە، خۆشی دەربڕین بەبۆنەی لەدایك بوونی کوڕو دڵتەنگ بوونو بێ تاقەتی بە لەدایك بوونی کچ – **کە بەداخەوە تا ئێستاش پاشماوەکەی دەبینرێت** – بەشێکە لە ڕەوشتی نەفامی پێش ئیسلامو خودای گەورە لە قورئاندا بە توندترین زمان هێرش دەکاتە سەر ئەم بیرکردنەوەو مامەڵە نا ئیسلامییەو دەفەرموێت:((وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ۝٥٨ يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلاَ سَاء مَا يَحْكُمُونَ۝٥٩)) (النحل٥٨- ٥٩)، **واتە:** کاتێك یەکێکیان مژدەی لەدایك بوونی کچی پێ دەدرێت ڕەنگی ڕەش دادەگەڕێتو لە خەفەتاندا پیش دەخواتەوەو ڕق دایدەگرێت، لەبەر خراپی ئەو مزگێنییەی پێی دراوە، جا بیر دەکاتەوە داخۆ بیهێڵێتەوەو ببێ بە مایەی سەرشۆڕی، یاخود زیندە بەچاڵی بکات؟ بەراستی دادوەریەکی خراپ دەکەنو حوکمێکی خراپ دەدەن، ئەمەی قورئان بۆی خستوینە ڕوو وێنەی پیاوێکی نەفامو دواکەوتووی سەردەمی نەفامی عەرەبەکانە.

لە ئیسلامدا کوڕو کچ هەردووکیان مرۆڤنو کەرامەتیان هەیەو کەسیان مرۆڤایەتی لەوی دیکە زۆرتر نیە، ئیسلام لە پێناو کەمکردنەوەی ئەو دابو نەریتە دواکەوتووانەی کاتی خۆی لە ڕێزی ئافرەتیان کەم دەکردەوەو پێشوازیان لە لەدایکبوونی نەدەکرد، هەوڵیداوە هەستی باوەڕدارانەی موسڵمانان تا ئەو پەڕی کە دەکرێت بەکاربێنێتو بەخێوکردنو میهرەبان بوون لەگەڵ کچو خوشکدا بکات

بەچاکەیەکی گەورەو مایەی چونە بەهەشت، بۆ ئەوەی لەم ڕێیەوە هانی موسڵمانان بدات بۆ ئەوەی بەوپەڕی دڵخۆشییەوە پێشوازی لە هاتنە دونیای کچەکانیان بکەن. پێغەمبەر (د.خ) لەم بارەوە دەفەرموێت ((مَنْ كانَّ لَهُ ثَلَاثُ بَنَاتٍ او ثلاثُ أخوات فاتَّقى الله وأَقامَ عليهنَّ كانَ مَعِيَ فِي الجنَّة – وَأَومَأَ بالسَّبابةِ والوسطى)) (رواه مسلم والترمذي).

شایانی باسە پێغەمبەری مەزنی ئیسلام تەنها کچی لە پاش بەجێماو ڕێزێکی یەکجار گەورەشی لە فاتیمەی کچی دەگرت، بەجۆرێك هەرکاتێك دەهات بۆ سەردانی لەبەردەم فاتیمەدا هەڵدەستاو عەباکەی سەرشانی کە بە ڕێزترین پۆشاکی ئەو بوو، بۆی ڕادەخستو نێوچاوانی ماچ دەکرد.دەشیفەرموو:(( فاطمة بضعة مني فمن اغضبها فقد اغضبني)).واتە: **فاتیمە بەشێکە لە جەرگم، هەرکەسێك ئازاری ئەو بدات ئازاری منی داوە.**

## ٢- ناونانو ناوی خۆش بۆ هەڵبژاردن:

یەکێك لە ڕیّو ڕەسمەکانی منداڵ بوون لە ئیسلامدا ناونانە، دایكو باوك دەبێت بە پێی توانا ئاژەلێك(عەقیقە) بۆ منداڵەکانیان سەربڕنو لە ڕۆژی حەوتەم یاخود چواردەهەمینی لەدایکبووندا، داوەتی خزمو دۆستان بکەنو بانگ بەگوێی منداڵەکەیاندا بدەنو ناوی بنێن، پێویستە ئەو ناوەی لە منداڵیش دەنرێت خۆشبێتو کاتێك ئەو منداڵە گەورە بوو لەناو کۆمەڵگەدا بەهۆی ناوەکەیەوە هەست بەکەم زانین نەکات.

## ٣- خۆشەویستیو نەرمو نیانی:

پێویستە باوكو دایك منداڵەکانیان خۆشبوێتو بە نەرمو نیانیو میهرەبانییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەنو مافی منداڵیشە لە خۆشەویستی دایكو باوکی بەهرەمەند بێت، هەستکردنی منداڵ بەخۆشەویستیو میهرەبانی دایكو باوکی ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە هەستکردنی بە ئارامیو ئاسودەییو پەروەردەبوونی بەشێوەیەکی ڕاستو دروستو پاراستنی لە ڕێلادانو نائارامی دەروونی، منداڵ دیاری خودایەو دەبێت روناکی چاوی دایكو باوکیش بێت، بەداخەوە لەبەر نەشارەزایی لە ئیسلامو هەندێك دابو نەریتی دواکەوتووی کۆمەڵایەتی، هەندێك پیاو زۆر منداڵەکانیانو بەتایبەتیش کچەکانیان لە باوەش ناگرنو خۆشەویستیان بۆ دەرنابڕن.

له كاتێكدا پیغەمبەر (د.خ) ئەمەی بە نیشانەی دڵرەقیو لاوازی باوەڕ داناوەو، خۆشی لە ژیانی خۆیدا بە تەواوی پێچەوانەی ئەوەبووە، پێغەمبەر (د.خ) جگە لە منداڵەکانی خۆی، لەگەڵ نەوەکانیو منداڵانی دیکەشدا زۆر نەرمو نیان بووەو یاری لەگەڵ کردوونو قسەی خۆشی بۆ دەکردن (حەسەنو حوسێن)ی کچە زای لە نوێژدا دەچونە سەر شانو ملیو یاریان دەکرد، ئەویش لە بەرخاتری ئەوەی دڵیان نەشکێتو یاریەکەیان لێ تێکنەچێت هەتا خۆیان نەهاتنیاتە خوارەوە لە سوجدە بەرز نەدەبۆوە، هەندێك جاریش دەچووە سوجدەو هەڵدەستایەوە هەندێك منداڵ لەسەر شانی بوونو بەرزو نزمی دەکردنەوە، رۆژێکیان یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) لە حاڵەتێکی لەم جۆرەدا بینی، بە پێغەمبەری وت: من تاکو ئێستا منداڵێکی خۆمم ماچ نەکردووە و لە باوەشم نەگرتووە، پێغەمبەر(د.خ) تێیگەیاند کە ئەوە نیشانەی دڵرەقییەو باوەڕو دڵرەقیش ئاسان نیە لە دڵێکدا بەیەکەوە کۆببنەوە. خۆشەویستیو نەرمو نیانیش پێچەوانەی شکاندنو مامەڵەی خراپ لەگەڵ کردنو توندو تیژییە، هەر بۆیە پێویستە دایكو باوکان رێز لە رای منداڵەکانیان بگرنو نەیانشکێننەوەو دڵیان نەشکێنن.

## ٤- دادپەروەری کردن لەنێوان منداڵەکاندا:

ئەرکی باوكو دایکە بە دادپەروەری لەگەڵ منداڵەکانیاندا بجوڵێنەوەو ناز نەدەن بە یەکێکیانو ئەوی دیکە یاخود ئەوانی دیکە پشت گوێ بخەن.

چونکە ئەمە زیانێکی گەورە بە پەروەردەو باری دەرونی منداڵ دەگەیەنێتو پێویستە ئەوەش بزانین لەم پرسەدا کچانیش هەمان مافی کوڕانو زیاتریشیان هەیە، پێشەوا بەیهەقی لە (ئەنەس)ەوە دەگێڕێتەوە:پیاوێك لە خزمەتی پێغەمبەردا(د.خ) دانیشتبوو، کوڕێکی منداڵی هاتە لایو ئەویش ماچی کردو خستیە باوەشییەوە، دوای ئەو کچێکی هات، کەچی تەنها پەلی گرتو لە تەنیشت خۆیەوە داینا، واتە نە ماچی کردو نەخستیە باوەشییەوە، کاتێك پێغەمبەر (د.خ) ئەمەی بینی بە کابرایەکەی فەرموو: دادپەروەریت لە نێوانیاندا نەکرد. پێغەمبەر (د.خ) لە فەرموودەیەکی دیکەدا لەم رووەوە دەفەرمووێت: ((**ساووا بين أولادكم في العطية ولو فضلت أحداً على أحدٍ لفضّلتُ النساء**)). **واتە:** بە یەکسانی دیاری بۆ منالەکانتان بکڕن، ئەگەر رێزی یەکێکم بدایە بەسەر یەکێکی دیکەدا، ئەوا رێزی کچەکانم دەدابەسەر کوڕەکاندا.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر لە دیاری بۆ کڕیندا بەشی کچ لە کوڕ زۆرتر نەبێت، بەهیچ جۆرێك نابێت لەو کەمتر بێت، چونکە ئیسلام هەردووکیان بەیەك چاو سەیر دەکات و لەسەر بناغەی رەگەز جیاوازیان لەنێواندا ناکات.

### ٥- مافی خوێندن و فێربوون:

ئیسلام بایەخێکی زۆر بە خوێندن و دەستخستنی زانیاری دەداو داواکردنی زانیاری و فێربوونیشی کردووە بە ئەرکێکی سەرشانی موسڵمانان. پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت:((داواکردنی زانیاری و فێربوون ئەرکی سەرشانی هەموو ژن و پیاوێکی موسڵمانە)).

لەبەر ئەوە ئەرکی دایك و باوکانە منداڵەکانیان بنێرنە بەر خوێندن و یارمەتیان بدەن بۆ درێژە پێدان و تەواوکردنی. هەروەها پێویستە کاربکەن بۆ ئەوەی کەش و هەوایەکی لەبار بۆ کچ و کوڕەکانیان بسازێنن بۆ ئەوەی لە خوێندندا سەرکەوتووبن و دواڕۆژێکی روناکیان هەبێت و خزمەتێکی بەرچاو بەخۆیان و کۆمەڵگەو وڵاتەکەیان بکەن.

### گفتوگۆ:

چۆن بتوانین لەناو خێزاندا بە مافەکانمان بەهرەمەند بین و رۆڵی خۆمان لەو روەوە چیە؟

### پرسیار:

منداڵ لە ئیسلامدا مافی بەسەر خێزانەکەیەوە هەیە، ئەو مافانە چ کاریگەریەکیان بەسەر پەروەردە بونییەوە هەیە؟

## وانەی بیست و هەشتەم:

### ئەرکی منداڵ بەرامبەر دایک و باوک

ڕونە دایباب لە ئیسلامدا پلەو پایەیەکی گەورەیان هەیە، ئیسلام داوا لە مرۆڤ دەکات بەو پەڕی جوانییەوە لەگەڵ دایبابی بجولێتەوەو ڕەفتاریان لەگەڵدا بکاتو ئەرکەکانی سەرشانی بەرامبەریان ئەنجام بدات. گرنگترین ئەو ئەرکانەش بریتین لەمانەی خوارەوە:

### ١- چاکە لەگەڵ کردنیان بەهەموو ماناکانیەوە:

خودای گەورە دەفەرموێت:((وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالجَنبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالاً فَخُورًا﴿٣٦﴾))(النساء ٣٦)، **واتە:** خودا بپەرستنو هاوبەشی بۆ پەیدا مەکەن، وە چاکە لەگەڵ دایبابانتان بکەن، سەیردەکەین ئایەتەکە چاکەکردن لەگەڵ دایبابی لەگەڵ داوای هاوبەشی پەیدانەکردن بۆ خودا باسکردووە، کە ئەوەش گرنگی مەسەلەکە دەردەخات.

### ٢- گویێ ڕایەڵی فەرمانە باشەکانیانو بەگوێکردنیان:

لە ئیسلامدا منداڵ دەبێت لە شتی چاکدا بەگوێی دایکو باوکی بکات. خودای گەورە دەفەرموێت:(( وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴿١٤﴾))(لقمان ١٤).

**واتە:** ئێمە ئامۆژگاری مرۆڤمان کردووەو ڕامان سپاردووە دەربارەی دایکو باوکی لەکاتێکدا دایکی بەئازارو ناڕەحەتی لە سکیدا هەڵی گرتووەو ماوەی دوو ساڵ شیری خۆی داوەتیێ، تا سوپاسی منو دایکو باوکی بکاتو گەڕانەوەش هەر بۆلای منە.

لێرەوە سوپاسکردنی خوداو دایکو باوك خراوەتە پاڵ یەك، ئەم ئایەتانە ڕێگەمان نیشاندەدەن کە لە شتی خراپدا بەگوێی دایکو باوکمان نەکەینو بەدەر لەوە گوێڕایەڵیان بین.

بەڵام ئەوەی دەبێت بیزانین بەگوێرەی ئایەتەکە ئەوەیە کە بەگوێ نەکردنی دایکو باوك لە شتێکدا کە خودا پێی ڕازی نیەو خراپە، ئەوە ناگەیەنێت لەگەڵیاندا خراپ بینو

چاکەیان لەگەڵدا نەکەین، چونکە دایكو باوك هەرچی بن‌و تەنانەت ئەگەر هیچ ئاینێکشیان نەبوو، مافی خۆیانەو ئەرکی سەرشانمانە چاکەیان لەگەڵدا بکەین‌و رەوشتمان لەگەڵیاندا جوان بێت‌و بەجوانی لەگەڵیاندا بجوڵێینەوە .

## ٣- ئازار نەدانی دڵ‌و دەرونیان‌و تورەنەبوون لێیان:

لە ئیسلامدا منداڵ نابێت لەدایكو باوکی خۆی تورە بێت یاخود وانیشاندا لێیان بێزارەو رووی بەرامبەریان گرژ بێت، بەتایبەتیش کاتێك کە پیر دەبن‌و دڵیان ناسك دەبێتەوەو پێویستەیەکی زۆرتریان بە یارەمەتی‌و دڵدانەوەی ئێمەیە.

پێغەمبەریش (د.خ) لە چەندین فەرمودەی خۆیدا هەرەشە لەو کەسانە دەکات دڵی دایكو باوکیان ئازار دەدەن، بەجۆرێك کە شکاندنی دڵی دایكو باوکی بەیەکێك لە گوناهە گەورەکان داناوە، سەبارەت بە پلەو پایەی دایکیش، رۆژێکیش پیاوێك لە پێغەمبەری پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا ئایە کێ شایستەترینە بۆ ئەوەی چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ فەرمووی: دایکت، وتی ئەی دوای ئەو؟ فەرمووی: دایکت، جارێکی دیکەش هەر فەرمووی: دایکت‌و لە جاری چوارەمیشدا فەرمووی: باوکت.

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمووێت:((**رضا الله في رضا الوالدين**)).

**واتە:** رازی بوونی خودا لە رەزامەندی دایكو باوکدایە.

## ٤- بە نەرم‌و نیانی قسە لەگەڵ کردنیان:

ئیسلام کە قەدەغەی کردووە منداڵ لە دایكو باوکی خۆی تورەبێت‌و دەنگیان بەسەردا بەرز نەکاتەوەو بێزاری خۆی لێیان دەربرێت، داوا دەکات لەگەڵیاندا زمان شیرین‌و نەرم‌و نیان بین، خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت:((وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا))(الاسراء٢٣).

**واتە:** بەجۆرێك قسەیان لەگەڵدا بکەن دڵدانەوەی تیدابێت‌و هەست بە قەدرو رێزی خۆیان بکەن‌و غەم‌و ئازاری دڵیان نەمێنێت.

## ٥- رێنوێنی کردنیان بۆ راستی‌و چاکە:

ئەگەر مرۆڤ هەستی کرد یەکێك لە دایبابی یاخود هەردووکیان لە هەڵەو تاواندا دەژین، ئەوا دەبێت بەشێوازێکی جوان هەوڵیان لەگەڵدا بدات بۆ ئەوەی واز لەو رەفتارو کردارانە بێنن کە خودای گەورە پێی ناخۆشەو بۆ ئەم دونیاشیان زیانیان لێ دەدات.

ئەوەتا (ئیبراهیم پێغەمبەر) درودی خودای لەسەر بێت روو دەکاتە باوکی‌و دەفەرمووێت:(( يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ )) (مریم -٤٤).

**واتە:** کاتێك ئیبراهیم بە باوکی ووت: بابە گیان داوات لێ دەکەم شوێنم بکەوە بۆ ئەوەی رێگەی راستت نیشان بدەم.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە ئیسلامدا هەموو مرۆڤێك خاوەنی کەسایەتی خۆیەتی‌و لێپرسراوێتی لەسەر شانە، ئێمە گەرچی لە شتە باشەکاندا بەگوێی دایبابمان دەکەین بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە گفتوگۆیان لەگەڵ نەکەین‌و بەشێوازێك کە رێزی تێدا پارێزراو بێت هەوڵی ئەوە نەدەین بیروڕا چەوتەکانیان بگۆڕین‌و لە هەندێك خراپە بیانگێڕینەوە.

بەتایبەتیش مرۆڤ لەدوای (باڵغ بوونی) یەوە- پێگەیشتنی لە رووی جەستەییەوە- لە ئیسلامدا دەبێتە خاوەنی ئەهلیەتی یاسایی تەواوو لە سەرجەم کردەوەکانی لێپرسراوەو خاوەنی کەسایەتی سەربەخۆی خۆیەتی، بەگوێ کردنی دایباب لە شتە باشەکانداو چاکە کردن لەگەڵیاندا، مانای توانەوەی کەسایەتی منداڵ‌و هەرزەکارنیە، بەڵکو بەشێکە لە ئەرکە ئیسلامی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئەخلاقیەکانی سەرشانمان بەرامبەر ئەوان‌و وەفاداربوونە بەرامبەر سۆزو خۆشەویستی‌و ماندوبونیان لە بەخێوکردن‌و پێگەیاندنمان‌و ملکەچبوونی فەرمانی پەروەردگارە، قورئان فێرمان دەکات لە شوێنی خۆیداو بەرامبەر داوای ناڕەوای دایباب منداڵ بڵێت – نا – بەڵام لەگەڵ ئەوەدا هەر چاك بێت لەگەڵیاندا.

## ٦- بەخێوکردنیان:

لە شەریعەتی ئیسلامدا بەخێوکردنی منداڵ تا دەگاتە قۆناغی باڵغ بوون لەسەر دایبابە، بەڵام دواتر ئەگەر دایك‌و باوك توانای بەخێوکردنی خۆیان نەبوو، لەبەر نەخۆشی‌و بێ ئیشی، یاخود پیری، یان هەر هۆیەکی دیکە، ئەوا بەخێوکردنیان‌و نەفەقەیان دەکەوێتە ئەستۆی کوڕەکانیان.

مرۆڤ دەبێت لەم کاتانەدا ئەو رۆژانەی لە بیرنەچێت کە ئەوان بۆ چەندین ساڵ بەخێویان کردووەو لە پێناو ئەودا ماندوبوون، هەر بۆیە پێویستە بەدەست‌و دڵێکی فراوانەوە بە خێویان بکات‌و نازیان هەڵبگرێت‌و نەهێڵێت هەست بەکەمی‌و بێ بەشی بکەن، دیارە پێویستە بوترێت ئەگەر مرۆڤ ماڵی جیابوو ئەوا سەردانی بەردەوامی بۆلای دایك‌و باوکی دەبێتە ئەرکێکی دیکەی منداڵ بەرامبەریان.

**گفتوگۆ:** له روانگەی ئەوەی کەلە پێشوو باسکرا گرنگترین گیروگرفتەکانی لاوان لەناو خێزانەکاندا چین؟

**پرسیار:**

١- جوان رەفتار کردن لەگەڵ دایباب واتای چیەو چ لێپرسراوێتییەك دەخاتە ئەستۆی مرۆڤەوە؟

٢- چارەنووسی ئەو کەسانە چیە کە رەفتاریان لەگەڵ دایبابیان خراپە؟

**لێکۆڵینەوە:** چۆن هاوسەنگی له نێوان پاراستنی ئازادی خۆمانو بەگوێکردنی دایبابو ئەرکە خێزانیەکانماندا بکەین؟

## وانەی بیست و نۆیەم:

### گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە دەبنە مایەی پاراستنی داوێن پاکی هەرزەکار

**١- بونی پەیوەندیەکی خۆشەویستی بەهێز لەگەڵ خودای گەورە.**

**٢- ئاگاداربێت بەگەورەبوونی هەست کردن بە بەرپرسیارێتی.**

**٣- هەڵبژاردنی هاوڕێی باش.**

**٤- هۆشیاربێت کەجەستەی بۆ شتی خراپ بەکارنەهێنێت و سەیری ئەوشتانە نەکات کەحەرامن یان ئەندامەکانی لە شتی نادروست بپارێزێت وئاگاداری نەخۆشیە سێکسییەکان بێت، کە ئەمڕۆ لەنەخۆشیە بلاوە ترسناکەکانن.**

زۆر بەهۆشاریەوە مامەڵە لەگەڵ هۆیەکانی راگەیاندن لە کەناڵە ئاسمانییەکان وئینتەرنێت و فیلمە جۆر بەجۆرەکاندا بکات، چونکە بەشێك لەم بابەتانە زیان بەخشن، بۆیە دەبێت خۆیان لێ دوربگریت بۆ ئەوەی تووشی زیانی دونیاو دوارۆژ نەبێت.

**٥- کۆنترۆڵکردنی ئارەزووی خواردن:**

واتە بوونی بەرنامەی دروست بۆخۆراك و گرنگی دان بەجۆری ئەو خۆراکانەی کەدەیخۆیت لەهەمان کاتدا خۆی بپارێزێت لە خواردن و خواردنەوەی حەرام.

**٦ - کۆنترۆڵ کردنی زمان:**

پێغەمبەری خودا(د.خ) لەفەرمودەیەکدا دەفەرموێت:((مَنْ كانَ يُؤمِنُ باللهِ وَاليَومِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً اوْ لِيَصمُت)). **واتە:** هەرکەسێك باوەڕی بەخوداو رۆژی دوایی هەیە باشتی چاك بڵێت یان بێ دەنگ بێت.

**٧ - خۆپاراستن لە خۆچواندن بەرەگەزی بەرامبەر:**

لەئیسلامدا پێویستە کوڕو کچ هەریەکەیان سیفەتە تایبەتییەکانی خۆیان بپارێزن و هەرەیەکەیان لەسنوری خۆیاندا شانازی بەرەگەزی خۆیەوە بکات و هیچیان هەستی خۆبەکەم زانینیان نەبێت بەرامبەر بە یەکدی.

**٨–پڕکردنەوەی کاتەکانی بێ کاری بە کاری داهێنەرانە:**

أ. دۆزینەوەی بواری لێهاتنەکانی خۆت وەك گەنجێك.

ب. ئامادەکردنی هۆکاری هێنانەدی لێهاتنەکان.

ج. دۆزینەوەو فێر کردنی ئەو ڕێگەیانەی کەلێهاتنەکانی گەشە پێ دەدەن.

د. دروست کردنی کێبڕکێ.

**گرنگترین جۆری ئەو ئارەزووانەی کە پێویستە هەرزەکار لەکاتی بێ کاریدا ئەنجامی بدات:**

أ. فێربوونی خوێندنەو نوسین و خەت.

ب. فێربونی قورئان و خوێندنەوەی ولەبەرکردنی.

ج. فێربوونی زمان.

د. فێربونی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت.

هـ. وەرزش.

و. فێربوونی عیبادەت وسونەتەکان.

ز. سەردانی کۆمەلأیەتی.

**٩ – هاندانی ڕەوشتی باش:**

پێویستە هەرزەکاری موسڵمان، بەتەنگ فێربونی ڕەوشتە باشەکانەوە بێت و وەك دڵ پاکی و سنگ فراوانی ولێبوردەیی و بەخشندەیی وچاکەخوازی.

**گفتوگۆ:**

بۆچی دەبێت هەرزەکار هەوڵی داوێن پاکی و کەمکردنەوەی فشاری غەریزەی سێکسی بدات و خۆی بەشتی باشەوە سەرقاڵ بکات؟

## وانەی سیەم:

### سێیەم ـ بە دەست هێنانی هۆشیاری و ڕۆشنبیری:

یەکەمین ووشەی قورئانی پیرۆز بە (إقرأ) واتە بخوێنە دەست پێ دەکات:(( اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ))(العلق ١) ، واتە: (بخوێنە بەناوی ئەو خودایەی کە دروستی کردوی).
هەروەها لەئایەتێکی دیکەدا بە پیتێکی نوسین و پێنووس سوێند دەخوات:((ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ))(القلم ١).

ئەمەش مانای گرنگی زانستو فێربوونە لە ڕوانگەی ئیسلامەوەو هاندانی موسڵمانانە بۆ ئەوەی لەرێگەی زانستەوە خودا بناسن.

ئیسلام فێربوون دەکاتە ئەرك لەسەر هەموو موسڵمانانو ئەگەر یەکێك هەوڵی بۆ نەدات لە ڕوانگەی شەرعەوە تاوانبار دەبێت، پێغەمبەریش بۆ ئەم مەبەستە دەفەرموێت:((طلبُ العلمِ فريضةٌ على كلِّ مسلمٍ ومُسلِمةٍ)). **واتە:** فێربوونی زانست ئەرکە لەسەر هەموو موسڵمانێکی پیاوو ژن.

لەبەر ئەوە گەنجی موسڵمانی هەرزەکار پێویستە وەك فەرمانێکی ئاینەکەی کەسێکی زیرەكو هوشیارو لێهاتوو بێتو فێربوونی زانست بە فەرز بزانێت.

**بۆ ئەوەش کە ببێتە هەرزەکارێکی موسڵمانی ڕۆشنبیر پێویستە چەند مەرجێکت تێدا بێت:**

**ئـ – خۆت بناسە:**

خودای گەورە لەئایەتێکدا دەفەرموێت:(( وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ))(الذاريات٢١)
واتە:(لەخۆتاندا هەیە بۆ نایبینن).

مرۆڤ ئەوەی نایزانێت بە دوژمنی خۆی دەزانێت، بۆ ئەوەی خۆتت خۆش بوێت پێویستە خۆت بناسیتو زانیاریت هەبێت دەربارەی خۆت هەتا بتوانیت بیپارێزیت، لەبەر ئەوە پێویستە ئەم زانیاریانەت هەبێت:

١ – سیفاتی هەر قۆناغێکی ژیانی مرۆڤ لەمنداڵیو هەرزەکاریو گەنجیو پیری.

٢ – زانیاریت هەبێت لەسەر پێکهاتنی جەستەی مرۆڤو کۆئەندامەکانیو چی پێویستە بۆ پاراستنیان لەنەخۆشیو ڕاگرتنی جەستە بە تەندروستیەکی باش.

**ب – ئاینەکەت بناسە:**

پێویستە شارەزایت لەئاینەکەتدا هەبێت، خودای گەورەش بۆمان روون دەکاتەوە کە باوەڕو ئاین پێویستە لەسەر زانست بنیات بنرێن، وەك دەفەرموێت:(( فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ...))(محمد١٩)، واتە: (بزانە کە هیچ خودایەك نیە بێجگە لە (الله) وە داوای لێخۆش بوون بکە بۆ تاوانەکانت)، هەندێك لەزانایانی ئیسلامیش دەڵێن (پێویستە زانست لەپێش کردارو گوفتاردا بێت).

رۆژێکیان لەلای پێغەمبەر (د خ) باسی دوو پیاویان کرد یەکێکیان خواپەرست بوو ئەوی دیکەیان زانا بوو، پێغەمبەر(د خ) فەرمووی:((**فضل العالم على العابد كفضلي على أدناكم**)) **واتە:** رێزی زانا بە سەر خواپەرستەوە، وەك رێزی من وایە بە سەر بچوکترین کەستانەوە، هەر لەبەر ئەوەیە کە لە لای خودا فێربوونی زانست لەکردنی کاری سوننەت گەورەترە.

خودای گەورە زۆر وەسفی کەسانی زاناو خاوەن زانیاری دەکاتو ئەوانەش بە مرۆڤی لەخواترس ناو دەبات، چونکە موعجیزەی ئیسلام زانستەو لە رێگەی زانستەوە مرۆڤ دەتوانێت زەوی ئاوەدان بکاتەوەو شارستانیەت بنیات بنێتو هەر لەم رێگەیەشەوە هەست بە گەورەیی خودا بکات، لەرێگەی دروست کراوەکانیەوە شوێن دەستی پڕ لەزانستو دانایی خودا ببینێت، لەبەر ئەوە لەئیسلامدا خوێندنو فێربوونی زانست بە عیبادەت لەقەڵەم دەدرێتو خاوەنەکەی پاداشتێکی زۆری خودایی وەردەگرێتو لەئاگری دۆزەخ دەپارێزرێتو دەچێتە بەهەشت.

**پ – نیشتمانەکەت بناسە:**

مەبەست لێرە ناسینی سێ جۆر نیشتمانە، نیشتمانی یەکەمین کە کوردستانەو ئێستا لەنێوان چوار دەوڵەتدا دابەش کراوە، گەلی کوردستان گەلێکە زۆرینەی موسڵمانەو هەر چوار بەشەکەی لەجوگرافیای وڵاتانی ئیسلامدایە، نیشتمانی دووەمیش ئەو وڵاتانەیە کە گەلانی موسڵمانی تێدا دەژین، چونکە لەگەڵ ئەم گەلانەدا شارستانیەتو مێژوو ئاینێکی هاوبەشمان هەیەو لەم روانگەیەوە دەبێت هەموومان وەك برا یەکدیمان خۆش بوێتو مافەکانی یەکدی بپارێزینو ستەم لەیەك نەکەینو هاوسۆزی کێشە رەواکانی یەکدی بین.

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت:((مَنْ لَمْ يَهْتَم بأمر المسلمِينَ فليسَ مِنْهُم)) **واتە:** هەر کەسێك بە تەنگ کێشەی موسڵمانانەوە نەبێت، لەئێمە نیە. ئەمەش دەخوازێت موسڵمانان هاوسۆزی کێشەکەی ئێمە بن.

نیشتمانی سێیەم نیشتمانێکی جیهانییە، چونکە ئێمە لەسەر ئاستی هەموو جیهاندا خودای گەورە بە مرۆڤ دروستی کردوین، لەبەرئەوە دەبێت پەیوەندیەکی دۆستانەمان هەبێتو لەپێناو دروست کردنی کۆمەڵگەیەکی مرۆیی کاربکەین، کەبنەماکەی ئاشتیو پێکەوەژیان وخۆشەویستی بێت.

**ت - ناسینی ژینگەو دەوربەرەکەت:**

پێویستە ئاگاداری گۆڕانکارییە سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستانو عیراق بیت، دەبێت وەك هاوڵاتیەکی دڵسۆز لەخەمی بەرەوپێش بردنی کوردستاندا بیتو هاوکاری دامو دەزگاکان بکەیت لەپێناو گەشەپێدانو ئاوەدانیو پاراستنی لە هەمو خراپەو ناتەواویەك.

## چوارەم - توانای کارکردن و پاشەکەوت کردن:

پێویستە هەر لە سەرەتای تەمەنەوە مرۆڤ لەسەر ئەوە رابێیت کە دەست بە پارەو سامانەوە بگرێتو زیادەڕەوی نەکات لەخەرج کردندا، چونکە خودای گەورە دەفەرموێت:(( وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ))(الاعراف ٣١).

**واتە:** بخۆنو بخۆنەوە بەڵام زیادەڕەوی مەکەن، چونکە خودای گەورە ئەوانەی خۆش ناوێت کە زیادەڕەوی دەکەن، لەهەمان کاتدا دەبێت مرۆڤێك بیت کە حەز لەکارو چالاکی بکەیتو بتوانیت لەژیاندا بەرنامەیەکت هەبێت، تاکو پشت بە خۆت ببەستیتو ئازادیو کەرامەتو رێزی خۆت بپارێزیت.

**پرسیار:**

ئیسلام چ گرنگییەك بە زانستو زانیاری دەدات ؟

**گفتوگۆ:**

چۆن ئاستی رۆشنبیری ئیسلامیو گشتی خۆمان بەرز بکەینەوەو ئەمە چ رۆڵێکی بۆ ئایندەی ژیانمانو رۆڵمان لەناو کۆمەڵگەدا هەیە؟

# پێرست